# ئەمە ڕاستییەکەیە



ئامادەکردنی:
شێخ عەبدولمەجید زندانی

وەرگێڕانی:
خالید حەسەن عەلی

ناوەندی کوردستان بۆ ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا
مرکز کوردستان للإعجاز العلمي في القرآن والسنة
Kurdistan Centre for Scientific Miracles in (Quran & Sunnah)



ناوی کتێب: ئەمە ڕاستییەکەیە
بابەت: ئیعجازی زانستی
نووسینی: عەبدولمەجید زندانی
وەرگێڕانی: خالید حەسەن عەلی
پێداچوونەوەی زانستی: مامۆستا فەرمان عوسمان شەریف
نەخشەسازی و دیزاین: ناوەندی ڕێنوێن
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
ساڵی چاپ: ٢٠٢٠
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٢٤٦)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێدراوە.

# پێڕست

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ          بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ
وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ
أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ
أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ٥٣

سُورَةُ فُصِّلَتْ

گومانــی تێـدا نییــە کــە پێغەمبــەر موحەممــەد (ﷺ) بــە ڕەحمــەت بـۆ هەمــوو جیهانیــان نێــردراوە، خــوای گــەورە دەفەرموێــت:

﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ (١٠٧)﴾ الانبیاء .

ئــەو وەک چـۆن بـۆ دەشــتەکییەکی بیابــان نێــردراوە، بــە هەمــان شــێوە بـۆ زانــای نێـو تاقیگەکانــی ئــەم ســەردەمە و گشــت ژیرییــەکان نێــردراوە .

پێغەمبەرانــی پێـش موحەممــەد (علیهم السلام) بە تایبەتــی دەنێردران بـۆ تیــرە و هــۆزی خۆیــان، ﴿...وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ (٧)﴾ الرعد.

واتە: (بـۆ هەمــوو قەومــێ پێغەمبــەرێ ئەنێــررێ کــە ڕێــگای ڕاســتیان پیشــان بـدا).

بـەڵام پەیامـی پێغەمبـەر موحەممـەد (ﷺ) بـۆ هەمـوو گـرۆی ئادەمیـزادە. لەبەرئـەوە موعجیزەکەشـی لـە هەمـوو موعجیزەکانـی پێغەمبەرانـی پێشـوو جودایـە.. موعجیـزەی پێغەمبەرانـی پێشـوو تەنها هاوسـەردەمانی ئـەو پێغەمبـەرە و چەنـد نەوەیەکـی کەمـی دوای ئـەوان دەیـان بینـی. پاشـان پێغەمبەرێکـی تـر دەنێـردرا تـا ئایینەکـە و موعجیزەکـەش نـوێ بکاتـەوە.

بـەڵام لەبەرئـەوەی پێغەمبـەر موحەممـەد (ﷺ) تـا ڕۆژی دوایـی کۆتاییـن پێغەمبـەرە، خـوای گـەورە موعجیزەکەشـی تـا ڕۆژی دوایـی هێشـتووەتەوە.

خـۆ ئەگـەر لـە جوولەکەیـەک یـان گاورێـک داوا بکرێـت موعجیـزەی (موسـا) یـان (عیسـا) - سـەلامی خوایـان لـێ بێـت - پیشـان بدەن.. بـێ گومـان هـەر یـەک لـە جولەکـە و گاورەکـە دەڵێـن توانـای ئەوەمـان نییـە، ناتوانـم گۆچانەکـەی موسـا پەیدابکـەم.. ناتوانـم عیسـا بهێنـم و مـردوو لـە بەردەمتـان زیندووبکاتـەوە، چونکـە ئێمـە جگـە لـە هەواڵێکـی مێژوویـی هیچـی ترمـان لـە بەردەسـتدا نییـە.

بەڵام ئەگـەر پرسیار لـە موسـڵمانێک بکرێت سـەبارەت بـە گەورەتریـن موعجیـزەی پێغەمبـەر (ﷺ) وەڵام دەداتـەوە و، دەڵێـت ئـەوە موعجیـزەی قورئانـە. چونکـە موعجیزەیەکـی بەردەوامـە لـە بەردەسـتماندا، خەڵکـی دەتوانـن بـی پشـکنن و لێـی وردببنـەوە، هـەر وەک خـوای گـەورە دەفەرموێـت:

﴿قُـلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْـبَرُ شَـهَادَةً قُـلِ اللّـهِ شَـهِيدٌ بِيْنِـي وَبَيْنَكُـمْ وَأُوحِـيَ إِلَيَّ هَـذَا الْقُـرْآنُ لأُنذِرَكُـم بِـهِ وَمَـن بَلَـغَ (١٩)﴾ الانعـام.

سروشـتی موعجیـزەی ئـەم پەرتوكـەش ئـەو زانسـتەیە كـە لەخـۆی گرتـووە وەک دەفەرموێـت:

﴿لَـكِنِ اللّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ( ١٦)﴾ النساء.

لەبەرئـەوە خەڵكـی ئـەم سـەردەمە، توێـژەران، مامۆسـتایانی زانكـۆ، پێشـەوایانی بیـری مرۆڤایەتـی هەمـوو دەتوانـن زانسـتەكانی ئـەم پەرتوكـە خواییـە بپشـكنن. خـۆ ئێسـتا ئـەوان لـە دەرخسـتنە گەردوونییەكانـدا زۆر لـە پێشـەوەن. لـە هەمـان كاتـدا قورئـان باسـی لـەو گەردوونـە و مرۆڤیـش كـردووە. ئـەی ئەنجامەكـە چـی بـوو؟ وەڵامەكـە بـا لـە دیمانەی ئـەم پرۆفیسـۆرانەوە وەربگریـن، كـە چـواردە پرۆفیسـۆرن لـە بـوارە جیاجیاكانـی زانسـتدا و كاتێـک ئایەتـە قورئانـی و فەرموودەكانـی پێغەمبەریـان لـە بوارەكـەی خۆیانـدا پیشـان دەدرێـت، بـە ویـژدان و بـە بوێرانـە شـایەتی ڕاسـتییەتی زانیارییـەكان دەدەن و تیایاندایـە موسـڵمان دەبێـت، هەشـیانە زۆر بـە ڕاشـكاوانە دەڵێـت بێگومـان موحەممـەد پێغەمبـەر و ڕەوانەكـراوی خودایـە.



بێگومـان بیـری خۆرئـاوا بـەردەوام لـە جەنگێکـی بەهێـز و دژواردایـە لـە نێـوان ئاییـن و زانسـتدا، بیرمەندێکـی خۆرئاوایـی نابینیـت قبوڵـی بـە یەکگەیشـتنی ئاییـن و زانسـت بـکات. ئەویـش لەبەرئەوەیـە کـە تەوراتـی پیـرۆزی لای گاورەکان دەڵێـت:

"ئـەو درەختـەی کـە لـە (ئـادەم) قەدەغـە کـرا بیخـوات، درەختـی زانیـاری (شـجرة المعرفـة) بـوو! دوای ئـەوەی کـە لێـی خـوارد چاوڕۆشـنی بـۆ زیـاد بـوو، بۆیـە پـەروەردگار خەشـمی لێگـرت".

لەبەرئـەوە ئەوروپـا مـاوەی دوو سـەدە قسـە و باسـی لەسـەر ئـەوە بـوو کـە ئایـا ئـەم زانسـتە گەردوونیانـەی کـە لـە وڵاتـی موسـڵمانانەوە هاتـوون پەسـەندی بکەیـن؟ یـان بیدەینـەوە بەسـەر موسـڵماناندا!

قەشـەکانیش بڕیـاری یەکـەم تاوانیـان دا بەسـەر ئـەم زانسـت و زانیاریانـەدا، بەڵگەیـان دەهێنایـەوە کـە تـەورات دەڵێـت کاتێـک ئـادەم لـەو درەختـەی خـوارد چاوڕۆشـنی بـۆ زیـاد بـوو، بەهـۆی ئـەوەش خـودا خەشـمی لـێ گـرت و لـە میهـری خـۆی دەری کـرد.

لەبەرئـەوە ئـەو ماوەیـە ورد و درشـتی ئـەم زانسـتانەیان لـە بناغـەوە ڕەتکـردەوە، بـەڵام کاتێـک پێشـەواکانی زانسـت لـە بزوتنەوەیەکـدا بەسـەر پیاوانـی کەنیسـەدا سـەرکەوتن، بـە ئاراسـتەی پێچەوانـە دەسـتیان کـرد بـە تۆڵـە سـەندنەوە، ویسـتیان لـە بناغـەوە ئاییـن قەدەغە بکـەن، سـەرەنجام ئەوەی ویسـتیان کردیـان. هەمـوو ڕێگایەکـی ناڕەوایـان بـۆ سـەرکەوتن لـەو جەنگـەدا گرتەبـەر، تـا کەنیسـەیان لـە بچووکترین بازنـەدا ئابلۆقـە دا.

لەبەرئـەوە کاتێـک لەگـەڵ خۆرئاواییـەک دەربـارەی ئاییـن و زانسـت بدوێیـت، سـەری سـوڕدەمێنێت و دەڵێت: "ئـەوە چـی دەڵێیـت؟" چونکـە ئـەوان ئیسـلام ناناسـن، نازانـن کـە ئیسـلام ڕێـزی زانسـت و زانایانـی گرتـووە و، زاناکانـی بـە شـاهید دانـاوە لـە دوای فریشـتەکان، لەسـەر ئـەوەی هیـچ خوایـەک نییـە شـایەنی پەرستن بێـت جگـە لـە (اللـه). وەک دەفەرموێـت: ﴿شَـهِدَ اللَّـهُ أَنَّـهُ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُـوَ وَالْمَلائِكَـةُ وَأُوْلُـوا الْعِلْـمِ﴾ (١٨) آل عمـران.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّاللَّه(١٩)﴾ محمد.

ئـەوان نازانـن ئـەو سـیفەتەی خـوای گـەورە ئادەمـی پـێ ڕێـزدار کـراوە بەسـەر فریشـتەکاندا سـیفەتی زانسـتە، ئـەو چیرۆکـەی لـە قورئانـدا هاتـووە لای ئێمـە، پێچەوانـەی ئەوەیـە کـە لـە تەوراتـی ئەوانـدا هاتـووە، دوای ئـەوەی شـێواندوویانە. قورئـان ڕایگەیانـدووە کـە زانسـت هـۆکاری ڕێزلێنانـی ئـادەم بـووە نـەک هـۆکاری دەرکردنـی. قورئـان ئەمـەی بـە ئاشـکرا ڕاگەیانـدووە.

لەبەرئـەوە کاتێـک لـە بـارەی ئیسـلام و زانسـتەوە بیـان دوێنیـت، وا گومـان دەبـەن ئەمیـش وەک ئایینەکـەی خۆیـان وایـە و، وا دەزانـن ئیسـلامیش هەمـان هەڵوێسـتی هەیـە لـە سـەر زانسـت. بـەڵام هـەرکات بـە ڕوونـی و ئاشـکرایی ڕاسـتیەکانیان بینـی، سەرسـامی دەیـان گرێـت.



یەکێـک لەوانـەی کەوتـە ئـەم حاڵەتەوە (پرۆفیسـۆر جـۆ لـی سمپسـن) بـوو، کـە پسـپۆڕی نەخۆشـییەکانی ئافرەتـان و منداڵبوونـە لـە زانکـۆی (نـۆرس وێسـترن) لە (شـیکاگۆ)ی وڵاتـە یەکگرتووەکانـی ئەمەریـکا.

Joe Leigh Simpson; Professor of Obstetrics and Gynaecology. North. Western University. Shicago, USA.



کـە بینیمـان و دوواندمـان، سـەرەتا لـە گوماندا بـوو لـە سـەر وتەکانمـان!

دەیویسـت دڵنیا بێت، ئایا ئەمانە دەقی قورئانن؟! دەقی سوننەتن؟!

بـەڵام کاتێـک دڵنیابـوو کـە ئێمـە تەنهـا دەقـی قورئـان یـان فەرمووودەمـان بـۆ هێنـاوە، ئـەو دەقانەشـی بینـی کـە پەیوەسـتبوون بـە بۆماوەزانییـەوە لـە قۆناغـە سـەرەتاییەکانی کۆرپەلـەدا لـەو قۆناغـەدا کـە هێشـتا (نوتفە)یە.

هەروەهـا وردەکاریـی ئـەو وەسـفانەی زانـی کـە قورئانـی پیـرۆز ڕوونـی کردوونەتـەوە کـە چۆن مرۆڤ لـە کۆبوونـەوەی دوو نوتفـەوە دروسـت دەبێـت و بڕیـاری دروسـتبوونی مرۆڤ دەدرێت بەهـۆی بەرنامـەی بۆماوەیـی لـە کرۆمۆسـۆمەکاندا، کە لـەم سـەردەمەدا دەیبینیـن ئـەو کرۆمۆسـۆمانە وردەکارییەکانـی مرۆڤـی لەخـۆ گرتـووە، وەک ڕەنگـی چاوەکان، ڕەنگی پێسـت، ڕەنگـی مـوو، هەروەهـا هەمـوو وردەکارییەکانـی تـری مرۆڤ، مرۆڤ لـەو کرۆمۆسـۆمانەوە ئەندازەگیـری بـۆ کێشـراوە، ئەویش کاتێـک لـە قۆناغـی نوتفەدایـە، واتـە مرۆڤ لـە قۆناغـی نوتفەدا بەرنامەڕێـژی بـۆ ئەنجام دەدرێـت.



خوای گەورە دەفەرموموێت:

﴿قُتِلَ الإِنْسَانُ مَا أَكْفَرَهُ (١٧) مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ (١٨) مِنْ نُطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ (١٩)﴾ عبس.

واتە: "بەکوشتچێ ئادەمیزاد، چەند کافرە! چی وا کافری کردووە؟ خوا ئەم ئادەمیزادەی لە چی دروست کردووە؟ لە دڵۆپێک وەدی هێناوە و ئەندازەشی بۆ داناوە".

کۆرپەلە لە پێش چل ڕۆژیدا ــ لە ماوەی چل ڕۆژی یەکەمیدا ــ هەموو ئەندامەکانی بۆ دروست دەبێت، بەوەش هەموو کۆئەندامەکان دەردەکەون، هەرچەندە یەک لە دوای یەک دەردەکەون.




وێنەی کۆرپەلە لە 41 ڕۆژ و لە 44 ڕۆژیدا

لەبەرئەوە لە چل ڕۆژی یەکەمدا کۆئەندامەکان دەست بە دروستبوون و کۆبوونەوە دەکەن، کۆرپەلەکە بەسەر خۆیدا دەچەمێتەوە.

وەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

"إن أحدكم يجمع خلقه في بطن أمه أربعين يوماً".

واتە: "بێگومان بەدیهێنانی هەر یەکە لە ئێوە لە سکی دایکیدا لە ماوەی (40) ڕۆژدا کۆ دەکرێتەوە".

پرۆفیسۆر (جو لی سمپسن) سەیری ئەم فەرموودەیەی کرد هەروەها سەیری فەرموودەی: "إذا مر بالنطفة اثنتان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكاً فصورها".

واتە: "کاتێک (42) شەو بەسەر نوتفەدا ڕۆیشت، خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت و شێوەی دیاری دەکات".



ئنجا پڕۆفیسۆر (جو لی سمپسن) دەستی کرد بە بەراورد کردنی هەردوو فەرموودەکە و سنووری جیاکەرەوەی نێوانیان. دوای ئەوەی بە درێژی وردەکارییەکانی بینی، لە یەکێک لە کۆنگرەکاندا هەستا و ڕای خۆی لەم بارەیەوە ئاشکرا کرد و وتی:

"لەم دوو فەرموودەیەوە دەتوانین خشتەیەکی دیاریکراو سەبارەت بە گەشەکردنە سەرەکییەکانی کۆرپەلە لە پێش (چل) ڕۆژیدا دەربهێنین. هەروەک لە بەیانیدا هەمان خاڵ دووبارە باسکرا کە ئەم فەرموودە پیرۆزانە لە توانایاندایە ببنە پێشەنگی هەموو زانست و زانیارییەکان لەم بوارەدا. بەمەش فەرموودەکان دەبنە پاڵپشت و ڕەنگدانەوەی زانستی خودایی".

شێخ زندانی: ئەو دەڵێت: "ئایین لە توانایدا هەیە ڕابەرایەتی زانست سەرکەوتووانە بکات. بڕوانە! کەچی هەندێک هەن دەڵێن ئایین دژی زانستە!".

بەڵام ئەم پڕۆفیسۆرە ئەمەریکیە دەڵێت: "ئایینی ئیسلام دەتوانێت سەرکەوتووانە سەرکردایەتیی زانست بکات".

بەڵێ وایە، ئەگەر تۆ چویتە کارگەیەکەوە و ڕێنمایی کەتەلۆگی کارگەکەت پێ بێت، بێگومان بە ئاسانی لە کارگەکە شارەزا دەبیت، چونکە تۆ ڕێنماییەکانی دروستکەرەکەیت پێیە، بەڵام ئەو کەسەی دێت و ڕێ نیشاندەری پێ نییە، بە ئاسانی شارەزا نابێت.

ئەم وشانەی (پرۆفیسۆر جو لی سمپسن)یش دەگەیەنینە گشت زانا موسڵمانەکان:

It follows, I think, that not only is there no conflict between genetics and religion, but in fact religion can guide science by adding revelation to some of the traditional scientific approaches. That there exists statements in the, Quran shown by science to be valid, which supports the fact that knowledge in the Quran is derived from God.

"بڕوام وایە هیچ جیاوازییەک لە نێوان زانستی بۆماوەیی و ئایین دا نییە، بەڵکو لە ڕاستیدا ئایین ڕابەری زانست بە دەرخستنی زیاتری زانستە باوەکان دەکات و دەرکەوتووە ئەوەی قورئانی پیرۆز چەندین سەدەیە ئاماژەی پێکردووە لەلایەن زانستەوە بە ڕاست دانراوە، ئەمەش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت کە زانیارییەکانی ناو قورئان لەلایەن خوداوەیە".

شـێخ زندانـی: بەڵـێ، منیـش دەڵێـم: "موسـڵمانان لـە توانایانـدا هەیـە ڕابەرایەتـی بزووتنـەوەی زانسـتی بکـەن و، زانسـت لـە شـوێنە ڕاسـتەکەی خۆیـدا دابنێنـەوە، بـەوەی کـە بیکەنـە بەڵگـەی بڕوابـوون بـە پـەروەردگار و ڕاسـتییەتی پێغەمبەرەکـەی (ﷺ)، خـوای گـەورەش ڕاسـتی فەرمـووە:

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّي يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَي كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٥٣)﴾ فصلت".



"بێگومان ئەمە وەسفی گەشەکردنی مرۆڤە هەر لە پێکهاتنی نوتفەی تێکەڵاوەوە هەتا دەبێتە بارستەیەکی ئەندامی.
بە ڕاستی ئەم وەسف و ڕوونکردنەوە ڕۆشن و گشتگیرانە بۆ هەر قۆناغێک لە قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ـ ئەگەر لە هەمووشیاندا نەبێت ـ بۆ چەندین سەدە لەمەوپێش دەگەڕێنەوە، پێش ئەوەی قۆناغە جیاوازەکانی گەشەکردنی مرۆڤ لە زانیارییە کۆنەکاندا تۆمار بکرێن".

پرۆفیسۆر جیراڵد سی گۆرینگەر

ئـەوە پرۆفیسـۆر (جێراڵد سـی گۆرینگـەر)ە پسـپۆڕی توێـکاری لـە بەشـی توێکاریـی لـە زانکۆی (جـۆرج تـاون) لـە (واشـنتۆن)ی وڵاتـە یەکگرتووەکانـی ئەمریـکا.

Gerald C. Goeringer ; Professor Anatomy, t the Department of Anatomy, George own Medical School, Washington DC, USA.



بەم پرۆفیسۆرە گەیشتین و لێمان پرسی:

ئایا لە مێژووی کۆرپەلەزانیدا باس لەوە کراوە کۆرپەلە بە چەند قۆناغێک دروست دەبێت؟

ئایا لەو پەرتوکانەی تایبەتن بە باسی کۆرپەلەزانی لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و دوای ئەویش بە چەندین سەدە، هیچ ئاماژەیەکیان تێدایە بۆ قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە؟ یان دابەشکردنی بۆ چەند قۆناغێک؟ یان پێش ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە هیچی لەبارەوە زانراوە؟

لە وەڵامدا وتی: "بێگومان یۆنانییەکان گرنگییان بە لێکۆڵینەوەی کۆرپەلە داوە و، ژمارەیەک لەوان هەوڵیانداوە وەسفی کۆرپەلە بکەن چی بەسەر دێت و چی تێدا ڕوودەدات".

پێمان وت: "بەڵێ ئێمە ئەوە دەزانین کە چەند تیۆرێکی زاناکان هەبووە، وەک تیۆرەکانی ئەرستۆ و جگە لەویش. بەڵام ئایا باس لەوە کراوە کە چەند قۆناغێک هەیە؟ چونکە ئێمە دەزانین قۆناغەکان هەتا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم نەزانراوبوون و هەتا سەرەتای سەدەی بیستەمیش بە تەواوی نە چەسپا".

دوای وتووێژێکی درێژخایەن، وتی: "نەخێر (باسی قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە نەکراوە)".

وتمـان: "ئایـا هیـچ زاراوەیـەک هەیـە بـۆ ئـەو قۆناغانـە وترابێـت، وەک ئـەو زاراوانـەی لـە قورئانـی پیـرۆزدا هاتـوون؟".

وتی: "نەخێر".

وتمـان: "ڕای تـۆ چییـە لەسـەر ئـەو زاراوانـەی کـە هەمـوو قۆناغەکانـی کۆرپەلـەی گرتووەتـەوە؟".

دوای وتووێژێکـی زۆر و پـاش ماوەیـەک، توێژینەوەیەکـی لـە کۆنگـرەی پزیشـکیی هەشـتەمی سـعودی پێشـکەش کـرد، سـەبارەت بـەو قۆناغانـەی لـە قورئانـی پیـرۆزدا هاتـوون کـە چەنـد مرۆڤایەتـی لێیـان بـێ ئـاگا بـووە. هەروەهـا سـەبارەت بـە گشـتگیری و وردی ئـەو زاراوانـەی قورئانـی پیـرۆز کـە بەکاریهێنـاون بـۆ کۆرپەلـە بـە دەسـتەواژەی کـورت و دەربڕینی پوخـت ڕاسـتییەکی زۆر لەخـۆ دەگـرن.



بەم شێوەیە پرۆفیسۆر ڕای خۆی دەڵێت:

پرۆفیسۆر گۆرینگەر:

"بێگومان ئەمە وەسفی گەشەکردنی مرۆڤە هەر لە پێکهاتنی نوتفەی تێکەڵاوەوە هەتا دەبێتە بارستەیەکی ئەندامی. بە ڕاستی ئەم وەسف و ڕوونکردنەوە ڕۆشن و گشتگیرانە بۆ هەر قۆناغێک لە قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ــ ئەگەر لە هەمووشیاندا نەبێت ــ بۆ چەندین سەدە لەمەوپێش دەگەڕێنەوە، پێش ئەوەی قۆناغە جیاوازەکانی گەشەکردنی مرۆڤ لە زانیارییە کۆنەکاندا تۆمار بکرێن".

شێخ زندانی: لێکۆڵینەوەکەی (پرۆفیسۆر گۆرینگەر) سەری کێشا بۆ دیاردەیەکی زانستی نوێ، کە ئەو گومانەی گاورەکان بەردەوام دەیوروژێنن، دەڕەوێنێتەوە.

گاورەکان دەڵێن عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە دایکەوە دروستبووە ئەی باوکی کوا؟

ئەم گومانە بڵاودەکەنەوە، نازانن دروستکراوی تر هەیە بە بێ باوک. قورئانی پیرۆز وەڵامیان دەداتەوە و نموونەی (ئادەم)یان بۆ دەهێنێتەوە.

پـەروەردگار دەفەرموێـت: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ (٥٩)﴾ آل عمران.

واتـە: "بـە ڕاسـتی نموونەی (بەدیهێنانـی) عیسـا لەلایـەن خـوداوە وەک نموونەی (بەدیهێنانـی) ئـادەم وایـە کـە لـە خـاک دروسـتی کـرد و لـەوەودوا فەرمانـی دا و، پێـی وت: ببـە (بـە ئینسـان) ئەویـش یەکسـەر بـوو".

ئێمـە سـێ مـرۆڤ دەبینیـن کـە هـەردوو باوانیـان بـە تـەواوی نەبووە:

ئـادەم (سـەلامی خـوای لـێ بێـت) دروسـتکراوێکە بـە بـێ بـاوک و دایـک.

حەوا دروستکراوێکە بە بێ دایک.

عیسـا (سـەلامی خـوای لـێ بێـت) دروسـتکراوێکە بـە بـێ بـاوک.

ئـەوەی توانیویەتـی ئـادەم (سـەلامی خـوای لـێ بێـت) بە بێ بـاوک و دایـک بـەدی بهێنێـت، دەشـتوانێت عیسـا (سـەلامی خـوای لـێ بێـت) بـە بـێ بـاوک دروسـتبکات. لەگـەڵ ئەوەشـدا گاورەکان بـەردەوام دەمەقاڵەیانـە لـەم بابەتـەدا، ویسـتی خوای پەروەردگاریـش وایـە بەڵگـە لـە دوای بەڵگەیـان بـۆ دەربخـات.

ئەی گاورەکان، بۆچی لەسەر ئەمە گومانتان هەیە؟

دەڵێـن: "لەبەرئـەوەی هەرگیـز دروسـتکراوێک نابینیـن بـێ بـاوک یـان بـێ دایـک بێـت".

لـە کاتێکـدا زانسـت دەریخسـتووە ئێسـتا زۆرێـک لـەو زینـدەوەر و بوونەوەرانـەی نـەوە دەخەنـەوە، بـە بـێ پیتاندنـی نێرینـە لـە دایـک دەبـن.

بۆ نموونـە هەنـگ، هەمـوو نێرینەکانـی بریتییـن لـە هێلکـەی نەپیتێنـراو ــ کـە بـە ئـاوی نێرینـە نەپیتێنـراوە ــ و، ئـەو هێلکەیـەی بـە ئـاوی نێرینـەش دەپیتێنرێـت دەبێتـە مێیـەی کارکـەر، بـەڵام نێرینـەکان تەنیـا لـە هێلکـەی شـاژن ــ بـە بـێ تۆوی نێرینە ـ دروسـت دەبن و لەسـەر ئەوەش نموونەی دیکە زۆرن. تەنانـەت ئێسـتا بـە هۆی پێشـکەوتنی زانسـتییەوە مرۆڤ گەیشـتووەتە ئـەوەی هەندێـک هێلکـەی زینـدەوەر بتروکێنێت و گەشـە پـێ بـکات بـە بـێ پێویسـتبوونی پیتاندنـی نێرینـە.

ئەوەتا (پرۆفیسۆر گۆرینگەر) باسی ئەمەمان بۆ دەکات:

پرۆفیسۆر گۆرینگەر:

"ئەگـەر بـە جۆرێکـی تـر بابەتەکـە بـاس بکەیـن، هێلکـەی نەپیتـراوی زۆرێـک لـە زینـدەوەر (وشـکاوەکییەکان و شـیردەرە بچووکـەکان) دەتوانرێـن بـە هـۆکاری میکانیکـی وەک دەرزی لێـدان یان بـە هـۆکاری مـاددی وەک لێدانـی گـەرمـی (الصدمة الحراريـة) یـان بـە هـۆکاری کیمیایـی و بەکارهێنانـی مـاددەی کیمیایـی جیـاواز چـالاک بکرێـن. ئـەم جـۆرە گەشـەکردنەی کۆرپەلـەش بـە سروشـتی دادەنرێـت".

شێخ زندانی: کەواتە گومانی گاورەکان لە کوێدایە؟

دەڵێن: "ئەستەمە دروستکراوێک هەبێت تەنیا لە دایکەوە بێت و باوکی نەبێت". ئەم بەڵگەیەش پێشکەش دەکرێت تا ببێتە پێوانە بۆ بەراوردکردنەکانی دواتر.

* ئیتر ئەم شک و گومانە بۆ؟

پەروەردگار وەڵامی بنبڕ و پێویستی داونەتەوە و نموونەی (ئادەم)ی هێناوەتەوە کە باوەڕیان پێیەتی و باوک دایکیشی نییە. ئێوە سەرتان دەرناچێت لە دروستکراوێک تەنیا لە دایکەوە بێت و باوکی نەبێت، بەڵام خوای گەورە نموونەی دروستکراوێکتان پیشاندەدات کە ئادەمە (سەلامی خوای لێ بێت) باوک و دایکی نییە و باوەڕیشتان پێی هەیە. خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ (٥٩)﴾ آل عمران.

ویستی خواش وایە پێشکەوتنی زانستی بەڵگەی ترمان لەسەر ئەم ڕاستییەی قورئان پێشکەش بکات. بەو جۆرە ئەم کتێبە پیرۆزە و ئایەتەکانی ڕۆشنتر دەبنەوە و، نەوە دوای نەوە گەورە زانایان زیاتر لەو کتێبە تێدەگەن و تامەزرۆییان تەواو نابێت، چونکە سەرسوڕهێنەرەکانی تەواو نابن..

"مـــن زۆر بەختـــەوەرم کــە بەشـــداری ڕوون کردنـــەوەی ئـــەو ئایەتـــە قورئانـــی و فەرموودانـــە دەکـــەم کـــە بـــاس لـــە دروستبوونی مرۆڤ دەکـەن و، مـن زۆر لام ڕوونـە و بـێ گومانم کـە ئـەم بەڵگانـە لەلایـەن خـودای پـەروەردگارەوە بـۆ (محمـد) هاتـوون، چونکـە ئـەو زانیارییانـە لـە دوای چەندیـن سـەدە لـەم دواییانـەدا نەبێـت نەزانرابـوون، ئەمـەش بـۆم دەسەلـمێنێت کە (محمـد) پێغەمبـەری خودایـە".

پرۆفیسۆر کیس مۆر



ئەمە پرۆفیسۆر (کیس مۆر)ە، یەکێکە لە گەورەترینی زاناکانی جیهان لە بواری (توێکاری و کۆرپەلەزانی). داوا لەم پرۆفیسۆرە کرا ببێتە ڕاوێژکاری زانستی، بۆ دەرخستنی ڕای خۆی لە ڕوانگەی زانستییەوە دەربارەی هەندێ ئایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) لە بواری پسپۆڕییەکەیدا.

Keith L. Moore; Professor Emeritus, Department of Anatomy and Cell Biology University of Toronto. Distinguished embryologist and the author of several medical textbooks, including Clinically Oriented Anatomy (3rd Edition) and The Developing Human (5th Edition), with T.V.N. Persaud.

ئـەم پرۆفیسـۆرە پەرتووکێکـی دانـاوە بـە نـاوی (قۆناغەکانی گەشـەکردنی مرۆڤ) ئـەم پەرتووکـە بـۆ (هەشـت) زمـان وەرگێـڕدراوە: (ڕووسـی، ژاپۆنـی، ئەڵمانـی، چینـی، ئیتاڵـی، پورتورگالـی، ئینگلیـزی، یوغسـلاڤی).

کاتێـک داوامـان لـێ کـرد ڕای خـۆی سـەبارەت بـەو ئایـەت و فەرموودانـە دەرببڕێـت کـە گـوێ بیسـتیان بـوو، سـەری سـوڕما و، سەرسوڕمانەکەشـی بـە چەنـد وتەیـەک دەربـڕی و وتـی: چـۆن موحەممـەد (ﷺ) پێـش (1400) سـاڵ توانیویەتـی وەسفی کۆرپەلـە و قۆناغەکانـی بـەو شـێوە ڕاسـت و وردانـە بـکات؟ لـە کاتێکـدا زانـاکان تەنیـا لـەم (30) سـاڵەی دواییـدا نەبێـت نەیـان زانیـوە؟! بۆیـە دەسـت بەجـێ سەرسـوڕمانەکەی گـۆڕدرا بـۆ پێشـکەش کردنـی ئـەم بابەتانـە لـە کـۆڕ و کۆبوونـەوە زانسـتییەکاندا. وتارێکـی پێشـکەش کـرد بـە ناونیشـانی (هەماهەنگـی کۆرپەلەزانـی لەگـەڵ قورئـان و سـوننەتدا).

دکتـۆر (عەبدوڵـلا نەصیـف) بەڕێوەبـەری پێشـووی زانکـۆی (مەلیـک عەبدولعەزیـز)، کـە بـەم وتانـە پرۆفیسـۆر (کیـس مـۆر)ی پێشـەکەش کـرد تـا وتارەکـەی بـدات:

"پێشکەشـکاری کـۆڕی ئەمـڕۆ پرۆفیسـۆر دکتـۆر (کیـس مـۆر)ە، پرۆفیسـۆری زانسـتی توێـکاری و کۆرپەلەزانییـە لـە (زانکـۆی تۆرنتـۆ) لـە کەنـەدا. ئـەم زانایـە پلـە بـە پلـە گەیشـتە ئـەم ئاسـتە لـە چەندیـن زانکـۆدا. پاشـان مـاوەی شـەش سـاڵە سـەرۆکی بەشـی کۆرپەلەزانـی و توێکارییـە

لـە (زانكـۆی تۆرنتـۆ). سـەرۆكايەتی چەنديـن كۆمەڵـەی نێودەوڵەتـی كـردووە، بـۆ نموونـە: كۆمەڵـەی زاناكانـی توێـكاری و كۆرپەلەزانـی لـە كەنـەدا و ئەمريـكا. هەروەهـا ئەنجومەنـی يەكێتيـی زيندەوەرزانـی، هـەروەک بـە ئەنـدام هەڵبژێـررا لـە كۆمەڵـەی پزيشـكيی شـاهانەی كەنـەدا و لـە ئەكاديميـای نێودەوڵەتـی خانەزانـی و، لـە يەكێتيـی ئەمريـكا بـۆ پزيشـكەكانی توێـكاری. هەروەهـا ئەندامـە لـە يەكێتيـی دوو ئەمريكاكـە لـە بەشـی توێكاريـدا. دانـەری چەنديـن پەرتووكيشـە. هەندێكـی لـە بـواری توێـكاری ئيكلينكـی و كۆرپەلەزانيدايـە. هەشـت پەرتووكـی هەيـە بـە سـەرچاوەی قوتابييانـی كۆلێـژە پزيشـكييەكان دادەنرێن، ئـەم كتێبانـە بـۆ (شـەش) زمـان وەرگێـڕاون: (ئيتاڵـی، ئەڵمانـی، پورتوگالـی، ئيسـپانی، يۆنانـی، چينـی)".

دكتـۆر مـۆر بەمجـۆرە دەسـتی بـە وتەكانـی كـرد:

It has been a great pleasure for me to help clarify statements in the Quran about human development. It is clear to me that these statements must have come to Muhammad from God, or Allah, because almost of this knowledge was not discovered until many centuries later. This proves to me that Muhammad must have been a messenger of God, or Allah.

"مـن زۆر بەختــەوەرم کــە بەشــداری ڕوون کردنــەوەی ئــەو ئایەتــە قورئانــی و فەرموودانــە دەکــەم کــە بــاس لــە درووســتبوونی مرۆڤــ دەکــەن و، مـن زۆر لام ڕوونە و بێ گومانم کە ئـەم بەڵگانـە لەلایـەن خـودای پـەروەرگارەوە بۆ (محمـد) هاتـوون، چونکـە ئـەو زانیارییانـە لـە دوای چەندیـن سـەدە لـەم دواییانـەدا نەبێـت نەزانرابـوون، ئەمـەش بـۆم دەسـەلمێنێت کـە (محمـد) پێغەمبـەری خودایـە".

شـێخ زندانـی بەدوایدا بـە ئـەم وتانـە دوا: ڕامێنـە لـە وتـەی ئــەم پرۆفیسـۆرە گەورەیـە کـە لـە بەناوبانگترینــی زاناکانــی کۆرپەلەزانییـە لـە جیهانـدا کاتێـک لـە بـواری پسـپۆڕییەکەی خۆیــدا لــە ئایەتــە قورئانییەکانــی کۆڵییــەوە. ســەرنج بــدە چــی وت:

هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە: موحەممەد لەلایەن پەروەردگارەوە نێرراوە.

کاتێـک پرۆفیسـۆر (کیـس مـۆر) تەماشـای (کرمی زەروو)ی لەنــاو گۆلــە ئــاودا کــرد و لەگــەڵ کۆرپەلــە لــە قۆناغــی (علقــة)دا بــەراوردی کــردن کــە یەکێــک لــە واتاکانی (علقــة) کرمـی زەرووە، لێکچوونێکـی گـەورەی لـە نێـوان هەردووکیانـدا بینـی و، پاشـان وتـی: کۆرپەلـە لـە قۆناغـی (علقـة)دا تـەواو لـە (کرمـی زەروو) دەچێـت و ڕوون کردنـەوەی زیاتـری لەسـەر دا: کاتێــک وێنەیەکــی کرمــی زەرووی هێنــا کــە لــە گۆلــە ئاوەکانــدا دەژی و لــە تەنیشــت وێنــەی کۆرپەلەیەکــەوە کــە لـەو قۆناغـەدا بـوو داینـا، هـەردوو وێنەکـەی بـۆ ڕوونکردنـەوە

خستە تەنیشت یەک و لە چەندین کۆنگرەدا بەم شێوەیە پیشانی پزیشکەکانی دەدا. وەک لەم وێنەیەدا دەیبینین:



هەروەها پرۆفیسۆر (کیس مۆر) ڕوونی کردەوە کە کۆرپەلە لە قۆناغی (علقة)دا لە بۆشایی منداڵداندا بەم جۆرە هەڵواسراوە، چونکە لە زمانی عەرەبیشدا (علقة) بە واتای هەڵواسراویش دێت.




**Figure 2:** We can see in this diagram the suspension of an embryo during the *alaqah* stage in the womb (uterus) of the mother. (*The Developing Human*, Moore and Persaud, 5th ed., p. 66.)

کۆرپەلە لە قۆناغی زەرووددا (علقة)، بە ناوپۆشی منداڵدانەوە بە پەلێکەوە خۆی هەڵدەواسێت، بە شلەیەکی لینجیش دەورە دەدرێت.

هەروەها (علقة) لە زمانی عەرەبیدا بە واتای خوێنی وەستاو دێت، دواتر پرۆفیسۆر (کیس مۆر) باسی ئەوەی کرد کە کۆرپەلە لە قۆناغی (علقة)دا خوێن لە مولوولە خوێنینەکانیدا وەستاوە و نەکەوتووەتە جوڵە پێش ئەوەی سووڕی خوێن لە نێوان کۆرپەلە و وێڵاش تەواو ببێت، بۆیە شێوەی کۆرپەلەکە لە خوێنی بەستوو دەچێت.




وێنەیەک سووڕی خوێنی کۆرپەلە لە ڕۆژی بیستەم دەردەخات، مولوولە خوێنەکان پڕن لە خوێن بەڵام قەتیس بوون پێش لێدانی دڵ لەبەرئەوە کۆرپەلەکە شێوەی پارچە خوێنێکی وەستاو وەردەگرێت.

هەر بەو جۆرە وشەی (علقة) هەموو وەسفەکانی کۆرپەلە لەو قۆناغەدا لەخۆ دەگرێت.

کەواتە کێ موحەممەد (ﷺ)ی لەمانە ئاگادارکردەوە؟

پاشان پرۆفیسۆر (کیس مور) باسی (مضغة)ی کرد و پارچەیەک قورە سوورەی پاکی هێنا و بە دەمی خۆی تۆزێک جووی، هەر وەک لە وێنەی (B)دا دەیبینین و وێنەیەکی تری هێنا کە وێنەی شێوەی کۆرپەلەیە وەک وێنەی (A) بەراوردی پێ کردن و وتی: بە ڕاستی کۆرپەلە لە (مضغة) واتە شتی جوراو دەچێت.




وێنەی کۆرپەلە لە تەمەنی 28 ڕۆژیدا لە قۆناغی مورغەدا، بە چەماوەیی دەردەکەوێت، وەک ماددەیەکی چەماوە کە بە توندی جورابێت، دەرکەوتنی دڵ بە ئاسانی دەبینرێت.

هەندێک لە ڕۆژنامەکانی کەنەدا زۆرێک لە لێدوانەکانی پرۆفیسۆر (کیس مۆر)یان بڵاوکردەوە، لە کۆتاییدا (کیس مۆر) سێ ئەڵقەی لە تەلەفزیۆنی کەنەدیدا سەبارەت بەو هەماهەنگییانەی کە لە نێوان زانیارییەکانی (1400) ساڵەی قورئان و دەرخستنە زانستییەکانی ئەم سەردەمەدا هەیە، پێشکەش کرد.

لە میانەی چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنییەکەیدا ئەم پرسیارەی ئاراستەکرا و پێی وترا:

ئەی پرۆفیسۆر مۆر مانای وایە تۆ باوەڕت هێناوە بەوەی کە قورئان وتەی خودایە؟

لە وەڵامدا وتی: "من هیچ قورسییەک لە پەسەندکردنی ئەمەدا نابینم".

پاشان پێی وترا: تۆ چۆن باوەڕ بە (موحەممەد) دەهێنیت؟ لە کاتێکدا تۆ باوەڕت بە (مەسیح) هەیە؟

وەڵامیدایەوە: "من بیروباوەڕم وایە هەردووکیان لە یەک قوتابخانەن".

بەم شێوەیە زاناکانی جیهان لەم سەردەمەدا، دەیسەلمێنن ئەم پەڕتووکە بە زانستی خودایی دابەزیوە .

وەک پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿لَكِنْ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلائِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيداً (١٦٦)﴾النساء.

کەواتە دەزانن کە (موحەممەد) (ﷺ) پێغەمبەری خودایە .



"پێشکەوتنی زانستەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا زۆر سست بوو، شتێکی زۆر کەم نەبێت لە بارەی کۆرپەلەزانییەوە نەزانرا بوو، بەڵام لە قورئانی کتێبی پیرۆزی موسڵمانەکاندا هاتووە کە مرۆڤ لە تێکەڵاوێکی ڕژاوی نێر و مێ دروست دەبێت.

لێرەدا بوار نییە، باسی چەندین بابەتی گرنگ و سەرنج ڕاکێشی تر بکەین کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون و پەیوەستن بە قۆناغەکانی پێش لە دایکبوونی مرۆڤ".

پرۆفیسۆر کیس مۆر




ئـەم پەڕتووكـە (The Developing Human) (مرۆڤـی گەشەسـەندوو).

سـەرچاوەیەكی زانسـتیی جیهانییـە، بـۆ زیاتـر لـە هەشـت زمـان وەرگێـڕراوە، دانەرەكـەی پرۆفیسـۆر (كیـس مـۆر)ە.

لـە ئەمریـكا لیژنەیـەك دروسـت كـرا بـۆ هەڵبژاردنـی باشـترین پەڕتـووك لـە جیهانـدا، كـە یـەك دانـەر داینابێـت، ئـەم پەڕتووكـە لای لیژنەكـە بـراوە بـوو. ئێمـەش بـە خاوەنـی ئـەم پەڕتووكـە گەیشـتین و چەندیـن ئایـەت و فەرمـوودەی زۆرمـان لـە بـواری پسـپۆڕیەكەی خۆیـدا ـ كـە كۆرپەلەزانییـە ـ پیشـاندا و هەرچیمـان پیشـاندا دڵنیـا بـوو.

پێمـان وت: "تـۆ لـە پەڕتووکەکەتـدا باسـی سـەدەکانی ناوەڕاسـتت کـردووە و وتووتـە: لـەو سـەدانەدا بـواری کۆرپەلەزانـی شـتێکی کـەم نەبێـت هیـچ پێشـکەوتنێکی ئەوتـۆی بـە خـۆوە نەبینیـوە.

لەگـەڵ ئەوەشـدا قورئانـی پیـرۆز لـەو سـەردەمەدا دابەزیوە و پێغەمبـەر موحەممـەد (ﷺ) خەڵکـی فێـری ئـەو ڕێنماییانـە دەکـرد کـە لەلایـەن خـوای پـەروەردگارەوە بـۆی دەنێـردرا و تیایـدا بـە وردی وەسـفی دروسـتبوونی مرۆڤ و قۆناغەکانـی گەشەسـەندنی کۆرپەلـەی کـردووە. تـۆ زانایەکـی جیهانیـت، بۆچـی ڕاسـتییەکان بـۆ خەڵـک ئاشـکرا ناکەیـت و ئـەو هەقیقەتـە قورئانییانـە لـە پەڕتووکەکەتـدا زیـاد ناکەیـت؟".

لـە وەڵامـدا وتـی: "بەڵگـەکان لای ئێـوەن نـەک لای مـن، ئـەو بەڵگانـەم بدەنـێ و، ئێمـەش بـەو جۆرەمـان کـرد. چونکـە ئـەو زانایەکـی بوێـر بـوو، ئـەوە بـوو کـردی بـە پاشـکۆیەک لـە چاپـی سـێهەمیدا، کـە بـە هەشـت زمانـی نێودەوڵەتـی لـە جیهانـدا بـڵاوە و ئێسـتا گـەورە زاناکانـی جیهـان بـە زمانـی ئینگلیـزی و ڕوسـی و چینـی و یابانـی و ئەڵمانـی و ئیتاڵـی و پورتوگالـی و یۆگسـلاڤی دەیخوێننـەوە. گـەورە زاناکانـی جیهـان کـە بـەو زمانانـە قسـە دەکـەن، نووسـینەکانی (کیـس مـۆر) لـەو بەشـەدا دەخوێننـەوە".

(پرۆفیسۆر کیس مۆر) لە پەڕتووکەکەیدا لە ژێر ناونیشانی سەدەکانی ناوەڕاست دەڵێت:

"پێشکەوتنی زانستەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا زۆر سست بووە. شتێکی زۆر کەم نەبێت لە بارەی کۆرپەلەزانییەوە نەزانراوە، بەڵام لە قورئانی کتێبی پیرۆزی موسڵمانەکاندا ئەوە هاتووە کە مرۆڤ لە تێکەڵاوێکی ڕژاوی نێر و مێ دروست دەبێت و چەندین ئاماژە هاتووە کە مرۆڤ لە نوتفەی مەنییەوە دروست دەبێت و، بە ڕوونی باس لەوە دەکات کە نوتفەی پێکهاتوو لە منداڵداندا وەک تۆوێک لە دوای شەش ڕۆژ جێگیر دەبێت. ئاشکراشە کە هێلکەی پیتێنراو دوای دروستبوونی، دەست بەجێ لە دوای شەش ڕۆژ لە پیتاندن دەست بە دابەشبوون و گەشە دەکات. بە هەمان شێوە قورئانی پیرۆز باسی لەوە کردووە کە (نوتفە) بەردەوام دەبێت لە گەشەکردن تا دەبێتە پارچەیەک خوێنی وەستاو (علقة). هێلکەی پیتێنراو پاش پێک هاتن و دابەشبوونی، شێوەی دەگۆڕێتە سەر شێوەی (کرمی زەروو)-کە یەکێک لە واتاکانی عەلەقە بە واتای کرمی زەروو دێت-، لەم قۆناغەدا کۆرپەلەکە بە تەواوی لە (کرمی زەروو) دەچێت.

بێگومان وێنەکان هیچ جیاوازییەکیان نییە لە ڕوانگەی شێوە و مژینی خوێنەوە."

هەروەهــا بــاس لــەوە دەکات دوای (علقــة)، ڕووکەشــی دەرەوەی کۆرپەلــە دەگۆڕێتــە ســەر شــێوەی شــتێکی جــوراو وەک داری کاژ، هــەروەک ئــەوەی شــوێنەواری ددانــی لەســەر بێــت و جــورا بێــت.



وێنەی کۆرپەلەیەک، ئەندامە جەستەییەکان دەرکەوتوون و، کۆرپەلەکە چووەتە شێوەی ماددەیەکی جوراو کە شوێنەواری ددانی لەسەر بێت.

ئەگـەر کۆرپەلـە (40) یـان (42) ڕۆژ بەسـەریدا بـڕوات، دەچێتـە شـێوەی مرۆیـی. ئیتـر لـەوە بـەدوا لـە کۆرپەلـەی ئـاژەڵان ناچێت، چونکە کۆرپەلـەی مرۆڤ تایبەتمەندییەکانـی مرۆڤـبوون لـەم قۆناغـەدا وەردەگرێـت. وەک لـە وێنەکـەی خـوارەوە ڕوون کراوەتـەوە.





وێنـــەی کۆرپەلـــە لـــە تەمەنـــی 46 ڕۆژیـــدا شـــێوەی مرۆیـــی وەرگرتـــووە.

هەروەهـــا دەڵێـــت قورئانـــی پیـــرۆز بـــاس لـــەوە دەکات کـــە کۆرپەلـــە لـــە نـــاو ســـێ پـــەردەی تاریـــک گەشـــە دەکات، وەک دەفەرموێـــت:

﴿يَخْلُقُكُـمْ فِي بُطُـونِ أُمَّهَاتِكُـمْ خَلْقـاً مِـنْ بَعْـدِ خَلْـقٍ فِي ظُلُـمَاتٍ ثَـلاثٍ .. (٦)﴾ الزمـــر.

کە ئەوەش ئاماژەیە بۆ:

دیواری دەرەکیی سکی ئافرەت.

دیواری منداڵدان.

پەردەی ناوەکی کە دەوری کۆرپەلەی ڕاستەوخۆ گرتووە.

لێرەدا بـوار نییـە باسـی چەندیـن بابەتـی گرنـگ و سـەرنج ڕاکێشـی تـر بکەیـن کـە لـە قورئانـی پیـرۆزدا هاتـوون و پەیوەسـتن بـە قۆناغەکانـی پێـش لـە دایکبوونـی مرۆڤـ.

ئەمـە ئـەوە بـوو کـە (د. مۆر) نووسـیویەتی و لـە جیهانـی ئەمـڕۆدا بـڵاوە. سـوپاس بـۆ خوا هەر ئەوەشـە کـە توێژینەوەی زانسـتی چەسپاندویەتی.

(پرۆفیسـۆر کیـس مـۆر) لـەوە دڵنیـا بـوو کـە دابەشـکردنەکانی ئەمـڕۆی قۆناغەکانـی کۆرپەلـە لـە جیهانـدا هەموویـان دابەشـکردنی قورسـن و ڕوون نیـن و بـۆ تێگەیشـتن لـە قۆناغەکانـی کۆرپەلـە سـوود ناگەیەنـن. ئەویـش لەبـەر ئەوەیـە کـە قۆناغـەکان ژمارەیـی دابەشـکراون، واتـە قۆناغـی ژمـارە یـەک، قۆناغـی ژمـارە دوو، قۆناغـی ژمـارە سـێ، چـوار، پێنـج و بـەو جـۆرە.

بـەڵام دابەشـکردنەکانی قورئـان پشـت بـە ژمـارە نابەسـتن، بەڵکـو هـەر قۆناغێـک پشـت بـە شـێوەی ڕوون و جیاکـراوە دەبەسـتێت. بۆیـە دابەشـکردنەکان لـە پەرتووکی پـەروەردگاردا بـەم جـۆرەن: (نوتفـە، عەلەقـە، موزغـە، ئێسـکەکان، داپۆشـینی ئێسـکەکان بـە گۆشـت، گەشـەکردن بـە خەلقێکـی تـر).

﴿ وَلَقَـدْ خَلَقْنَـا الإِنسَـانَ مِـنْ سُـلالَةٍ مِـنْ طِـينٍ (١٢) ثُـمَّ جَعَلْنَـاهُ نُطْفَـةً فِي قَـرَارٍ مَكِـينٍ (١٣) ثُـمَّ خَلَقْنَـا النُّطْفَـةَ عَلَقَـةً فَخَلَقْنَـا الْعَلَقَـةَ مُضْغَـةً فَخَلَقْنَـا الْمُضْغَـةَ عِظَامـاً فَكَسَـوْنَا الْعِظَـامَ لَحْـماً ثُـمَّ أَنشَـأْنَاهُ خَلْقـاً آخَـرَ فَتَبَـارَكَ اللَّـهُ أَحْسَـنُ الْخَالِقِـينَ (١٤)﴾ المؤمنـون.

هەروەهـا وردەکاری تـر هـەن لـە نوتفـەدا و وردەکاری تـر هـەن لە (گەشـەکردن بـە خەلقێکـی تـر).

سـەبارەت بـەم دابەشـکردنە قورئانییانـەی کـە پشـت دەبەسـتن بـە شـێوەی دیاریکـراو و جیاکـەرەوە لـە شـێوەکەی تر، (پرۆفیسـۆر کیـس مـۆر) دەڵێـت:

"ئەمانـە دابەشـکردنی زانسـتی و وردن و دابەشـکردنی ئاسـان و ڕوونـن و واتـا بەخشـن"، لەبەرئـەوە لـە یەکێـک لـە کۆنگرەکانـدا هەسـتا و بـە ڕاشـکاوانە ئەمـەی ئاشـکرا کـرد و وتـی:

Because the staging of human embryos is complex, owing to the continuous process of change during development, it is proposed that a new system of classification could be developed using the terms mentioned in the Quran and Sunnah. The proposed system is simple, comprehensive, and conforms.to present embryological knowledge.

"بە هۆی ئەو گۆڕانە بەردەوامانەی بەسەر کۆرپەلەدا دێن، لێکۆڵینەوە لە قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلە ئاڵۆزە. لەبەرئەوە دەکرێت سیستمێکی نوێ بۆ جیاکردنەوەی قۆناغەکان بنیات بنرێت. ئەویش بە بەکارهێنانی ئەو زاراوە و چەمکانەی کە لە قورئان و سوننەتی پیرۆزدا باسیان کراوە. بێگومان ئەم سیستمە نوێیە بەوە جیادەکرێتەوە کە ئاسانە و وردە. زیاد لەوەش لەگەڵ زانستی کۆرپەلەزانی ئەمڕۆدا ڕێک دەکەوێت".

The intensive studies of the Quran and Hadith in the last four years have revealed a system of classifying human embryos that is amazing since it was recorded in the seventh century A.D... the descriptions in the Quran cannot be based on scientific knowledge in the seventh century.

"لێکۆڵینەوە چڕوپڕەکانی ئەم چوار ساڵەی دوایی دەریان خست کە قورئان و فەرمووده ئامێری پۆلێن کردنی قۆناغەکانی کۆرپەلەی مرۆڤن. کە ئەوەش جێگای سەرسامییە، چونکە ئەو زانیاریانە لە سەدەی حەوتەمدا تۆمار کراون، ئەوەی زانراویشە لە مێژووی کۆرپەلەزانیدا، هەتا سەدەی بیستەم نەبێت، هیچ شتێک سەبارەت بە قۆناغەکان و پۆلێن کردنی کۆرپەلە نەزانراوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە وەسفکردنی کۆرپەلەی مرۆیی لە قورئانی پیرۆزدا ناگونجێت لەسەر زانیاری سەدەی حەوتەم بنیات نرابێت، تاکە دەرئەنجامی ژیریش ئەوەیە کە بڵێین: ئەو وەسفانە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ موحەممەد (ﷺ) نیگا کراون و، هیچ کەس لەوکاتەدا نەیتوانیوە ئەم وردەکارییانە پەی پێ ببات. جگە لەوەش پێغەمبەر (ﷺ) نەخوێندەوار بووە و، لە توانایدا نەبوو مەشقی زانستی وەربگرێت".

لێرە شێخ زندانی بە دکتۆر مۆری گوت: "ئەمانەی کە تۆ وتت ڕاستن، بەڵام ئەمانە کەمێکن لەو ڕاستییانەی کە لە بواری کۆرپەلەزانی لە قورئان و سوننەت، بە تۆ پیشان دراون، بۆچی ئێستا بە ویژدانەوە بوارێک لە پەڕتووکەکەتدا بۆ ڕوون کردنەوەی هەموو ئایەت و فەرموودەکانی تریش ناکەیتەوە، کە پەیوەستن بە بوارەکەی خۆتەوە؟".

کیس مۆر بەم وتانە وەڵامی دایەوە: "من ئەندازەی گونجاوم لە شوێنی گونجاودا، لە پەڕتووکێکی زانستیی تایبەتمەندا نوسیووە، بەڵام ڕێت پێ دەدەم، ئەو زیادە ئیسلامییانە بۆ پەڕتووکەکەم زیاد بکەیت، بە جۆرێک هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانەی باسمان کرد، لە شوێنی گونجاوی خۆیاندا دابنێیت و پاشان ڕووەکانی ئیعجاز لەم کتێبەدا پێشکەش بکەیت و ڕوونی بکەیتەوە". منیش بەو جۆرەم کرد، (پرۆفیسۆر کیس مۆر)یش پێشەکییەکی بۆ زیادە ئیسلامییەکان نووسی.

ئەمەش ئەو پەڕتووکەیە کە (پرۆفیسۆر مۆر) پێشنیاری کرد لەگەڵ زیادە ئیسلامیەکان وەک دەیبینین.




بۆ هەموو پەڕەیەک لە پەڕەکان کە ڕاستییەکانی کۆرپەلەزانی تێدایە لە بەرامبەریدا ئەو ئایەت و فەرموودانەی پێغەمبەرمان دانا کە ڕووی ئیعجازەکە ڕوون دەکەنەوە.

بێگومان ئەمڕۆ لە چاوەڕوانی کاتێکداین لەگەڵ ئیسلام بۆ فەتحێکی نوێی ژیریی مرۆڤە بەویژدانەکان.

"به ڕاستی من شتێک نابینم، هۆکارێک نابینم، بەڵگەیەک نابینم بیر و بۆچوونەکانی موحەممەد (ﷺ) هەڵبوەشێنێتەوە، کە بێگومان دەبێ ئەو زانیارییانەی لە شوێنێکەوە وەرگرتبێت. لەبەرئەوە هیچ دژایەتییەک نابینم لەگەڵ ئەو بۆچوونەی کە وەسفە خواییەکە بە شێوەیەکی گشتگیری هەموو ڕووەکانی گرتووەتەوە".

پرۆفیسۆر مارشڵ جۆنسن

ئەمـە (پرۆفیسـۆر مارشـڵ جۆنسـن)ە، سـەرۆکی بەشـی توێـکاری و بەڕێوەبـەری پەیمانـگای (دانیـال) لـە زانکـۆی (تۆمـاس جێفرسـن) لـە (فیلادلفیـا)ی وڵاتـە یەکگرتووەکانـی ئەمریـکا.




E. Marshall Johnson; Professor and Head of the Department of Anatomy and Developmental Biology, and Director of the Daniel Institute، Thomas Jefferson University, Philadelphia, Pennsylvania, USA.

لە کۆنگرەی هەشتەمی پزیشکیی لە وڵاتی سعودیە بەم پرۆفیسۆرە گەیشتین. لیژنەیەکمان بۆ تایبەت کرا بۆ لێکۆڵینەوەکانی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا. یەکەمین کەس کە لە لیژنەکە پێی گەیشتین ئەم پرۆفیسۆرە بوو.

دەستی بە پرسیار کرد و وتی: بابەتی ئەم لیژنەیەمان چییە؟

ئێمەش وەڵاممان دایەوە: بابەتەکەمان بریتییە لە لێکۆڵینەوەی پەیوەندی نێوان زانیارییەکانی قورئان و سوننەت پێش (1400) ساڵ لەگەڵ ئەوەی زانستی نوێ دەریخستووە.

وتی: وەکو چی؟

وتمان: "بۆ نموونە زانست دەریخستووە مرۆڤ بە چەند قۆناغێک دروست دەبێت، قورئانی پیرۆزیش پێش (1400) ساڵ ئەو قۆناغانەی باس کردووە".

پرۆفیسۆر دانیشتبوو یەکسەر هەستا و بە دەنگێکی بەرز وتی: نەخێر، نەخێر، نەخێر!

ئێمەش پێمان وت: دانیشە دکتۆر..!!

- وتی: نا دانانیشم ئەمە چ قسەیەکە تۆ دەیکەی؟

- ئێمە دەمانزانی بۆچی وا کاری تێکرد، چونکە ئەو یەکێکە لە زانا ناودارەکانی ئەمریکا و دەیزانی لە دوای داهێنانی وردبین لە سەدەی شانزەهەمدا و تێکڕای پزیشکەکان بە درێژایی سەدەی حەڤدەهەم، بڕوایان وابوو کە مرۆڤ بە تەواوی لە ناو گیانداری مەنەوی (سپێرمی پیاو)دا دروست دەبێت، وەک لەم وێنەیەدا دەیبینین:



ئەم وێنەیە پزیشکەکان لەو سەردەمەدا کێشاویانە هەتا دەریبخەن مرۆڤ بە دروستکردنێکی تەواو لە گیانداری مەنەویدا دروست دەبێت، ئەم بیروباوەڕەش هەتا سەدەی هەژدەهەم لای ناموسڵمانەکان بەردەوام بوو.

بەڵام هەر کە هێلکە لە سەدەی هەژدەهەمدا دۆزرایەوە، هەموو زاناکان بۆچوونیان گۆڕی و وتیان: نەخێر مرۆڤ بە دروست کردنێکی تەواو لە هێلکەی ئافرەتدا دروست دەبێت چونکە گەورەترە، بەوەش ڕۆڵی پیاوان فەرامۆش کرا هەروەک چۆن لە سەدەی هەڤدەیەمدا ڕۆڵی ئافرەت فەرامۆش کرابوو. هەتا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا زاناکان وردە وردە دەریانخست کە مرۆڤ بە چەند قۆناغێک دروست دەبێت.

لەبەرئەوە کاتێک کە بە پرۆفیسۆر مارشاڵ جۆنسن وترا، ئەمە لە قورئانی پیرۆزدا (1400) ساڵە باس کراوە، هەستا و هاواری دەکرد: No, No, No. ئێمەش هەستاین بۆ لای و قورئانی پیرۆزمان پێدا. پێمان وت: فەرموو بیخوێنەرەوە ئەم ئایەتەمان پیشان دا و ئەویش وەرگێڕانەکەی بە زمانی ئینگلیزی خوێندەوە:

﴿مَا لَكُمْ لا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَاراً (١٣) وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَاراً (١٤) نوح﴾.

واتە: "ئەوە چیتانە لە شکۆ و گەورەیی خوا ناترسن؟ لە کاتێکدا ئێوەی بە چەند قۆناغێک بەدیهێناوە".

پاشان ئەم ئایەتەمان بۆ خوێندەوە:

﴿...يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقاً مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلاثٍ.... (٦)﴾ الزمر.

واتە: "لە سکی دایکتاندا بەدیتان دەهێنێت قۆناغ دوای قۆناغ لە سێ تاریکاییدا".

ئنجا دانیشتەوە و وتی: بەڵام دەکرێت بۆ ئەمە سێ لێکدانەوە هەبێت:

یەکەم: ئەوەیە ڕێکەوت بێت.

ئێمەش زیاتر لە (25) دەقی قورئانمان بۆ کۆکردەوە و خستمانە بەردەستی.

وتمان: ئایا دەکرێت هەموو ئەم دەقانە ڕێکەوت بن؟

پاشان قورئانی پیرۆز بۆ هەموو قۆناغێک ناوێکی داناوە: نوتفە دوای ئەوە (علقة) (خوێنی تەڕی وەستاوی شێوە زەرووی وابەستە)، دواتر پێکهاتەیەکی وەک جوراو (مضغة)، ئنجا دروستبوونی ئێسک (عظام)، لە پاشان داپۆشینی ئێسک بە گۆشت (فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا)، لە کۆتاییدا گەشەکردنی لە دروست کردنێکی تردا (ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ).

ئایا دەگونجێت ناو هێنانی هەموو ئەو قۆناغانە، دەکرێت ڕێکەوت بن؟

وتی: نەخێر.

وتمان: ئەی چی ماوە؟

وتی: دووەم دەتوانرێت بوترێت: موحەممەد میکرۆسکۆبی پێشکەوتووی لە لا بووە.

وتمان: "تۆ دەزانیت تێگەیشتنی درێژە و وردەکارییەکانی ئەو قۆناغانە کە قورئان باسی لێوە کردوون بە هۆی میکرۆسکۆبی زۆر پێشکەوتوو نەبێت ناتوانرێت بزانرێت، بێگومان کەسێکیش ئەو **میکرۆسکۆبە گەورانەی هەبێت، پێویستە تەکنیکێکی زۆر بەرزی لە لا بووبێت،** بە جۆرێک ڕەنگی دابێتەوە لەسەر خواردن و خواردنەوە و جەنگ و ئاشتییەکەی و، دەبێت لە نەوەی پێش خۆی وەری گرتبێت و، بۆ نەوەی دوای خۆیشی بە جێی هێشتبێت".

دوای ئەوە دەستی کردە پێکەنین...!

وتی: "لە یەکێک لە پێشانگاکاندا یەکەمین (میکرۆسکۆب)م بینی کە بۆ یەکەم جار لە جیهاندا داهێنرابوو، تەنها لە (10) جار زیاتر توانای گەورەکردنی نەبوو، تەنانەت نەیدەتوانی وێنەکەش بە ڕوونی نیشان بدات. نەخێر.. هەرگیز موحەممەد دەزگا و میکرۆسکۆبی لە لا نەبووە. کەواتە هیچ نەماوە ئەوە نەبێت کە بڵێین: ئەو نێرراوە

لەلایـەن خـوداوە". لـە دواییـدا دەسـتی کـرد بـە نووسـینی لێکۆڵینەوەکانـی ئیعجـازی زانسـتی و دەربـارەی قۆناغەکانـی گەشـەکردنی کۆرپەلـە توێژینەوەکانـی چڕ کـردەوە.

لـە کاتێکـدا (کیـس مـۆر) و پزیشـکەکانی تـر، باسـەکانیان لەسـەر ڕووی دەرەوەی کۆرپەلـە بـوو، بـەڵام ئـەم (مارشـڵ جۆنسـن)ە، پێشـکەش کردنـی لێکۆڵینەوەکانـی لەسـەر وەسـفە وردەکانـی قورئانـی پیـرۆز بـوو بـۆ شـێوەی دەرەوەی کۆرپەلـە هەروەهـا بـۆ پێکهاتەکانـی ناوەوەشـی.

یەکێک لە وتەکانی (پرۆفیسۆر مارشڵ) ئەمە بوو:

The Quran describes, not only the development of external form, but also emphasizes the internal stages, the stages inside the embryo, of its creation and development, emphasizing major events recognized by contemporary science.

لە ڕاستیدا قورئانی پیرۆز جگە لەوەی کە وەسفی قۆناغە دەرەکییەکانی کردووە، هەروەها جەختی کردووە لە سەر قۆناغەکانی ناوەوەش. واتە ئەو قۆناغانەی کە لە کاتی دروستبوون و گەشەکردنیدا بەسەر ناوەوەی کۆرپەلەدا دێن. ئەمەش بۆ دووپات کردنەوەی ئەو ڕووداوە سەرەکییانەیە کە زانایانی هاوچەرخ دەیزانن.

شێخ زندانی: "ئەم وێنەیەی (مضغة)کە دەیبینین، لەو شتانە بوو کە پرۆفیسۆر پێشکەشی دەکرد و بە بەڵگە دەیهێنایەوە. زاراوەی (مضغة) شێوەی دەرەکی کۆرپەلەکەمان دەداتێ، چونکە وەک دەبینین چەماوەیە و لە کۆتایی ئەو چەماوەیەدا شوێنەوار هەیە کە وەک ئەوەی جێگای ددانی لەسەر بێت وایە. تا شێوەی (مضغة) کە بە واتای شتی جوراو دێت ببەخشێت".

هەڵئاوسان و چاڵ و چۆڵی و ڕوویەکی خواروخێچ دەبینین کە شێوەی جوراو دەبەخشێت، (مضغة) لێرەدا درێژییەکەی (یەک) سانتیمەترە.



## کۆرپەلە لە قۆناغی مۆزغەدا

ئەگەر بڕگەیەکی لێ وەربگرین و توێکاری لەسەر بەشەکانی ناوەوەی بکەین، دەبینین زۆربەی کۆئەندامەکان دروستبوون، لە وێنەکەدا دەبینین بەشێک لە خانەکان دروستبوون، بەڵام بەشەکانی تر هێشتا دروست نەبوون.

خۆ ئەگەر بمانەوێت وەسفی (مضغة) بکەین، پرۆفیسۆر مارشڵ جۆنسن دەڵێت: دەبێت چی بڵێین؟ ئایا بڵێین دروست بووە (مخلقة)؟ ئەمە تەنها بەسەر ئەو بەشەدا دەچەسپێت کە دروست بووە، یان بڵێین دروست نەبووە (غیر مخلقة)؟ ئەمەش تەنها بەسەر ئەو بەشەدا دەچەسپێت کە دروست نەبووە.

وتی: پێویستە لەسەرمان کە پێکهاتەی ناوەوەی (مضغة) بەو شێوەیە وەسف بکەین کە قورئانی پیرۆز وەسفی کردووە.

لەبەرئەوە وەک قورئانی پیرۆز دەڵێین:

﴿..ثُمَّ مِنْ مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ ... (٥)﴾ الحج.



پاشان پوختەی توێژینەوەکەی هێنا و گوتی:

As a scientist, I can only deal with things which I can specifically see. I can understand embryology and developmental biology. I can understand the words that are translated to me from the Quran. As I gave the example before, if I were to transpose myself into that era, knowing what I knew today in describing things. I could not describe the things which were described. I see no evidence for the fact to refute the concept that this individual, Muhammad, had to be developing this information from some place. So I see nothing here in conflict with the concept that divine intervention was involved in what he was able to write.

"من وەکو زانایەک دەتوانم تەنها مامەڵە لەگەڵ ئەو شتانە بکەم کە دەیانبینم، دەتوانم لە زانستی کۆرپەلەزانی و گەشەسەندنی زیندەوەرزانی تر تێبگەم، دەتوانم لەو وشانەی قورئانی پیرۆزیش تێبگەم کە بۆم وەرگێڕدرا. هەروەک پێشتر نموونەکانم بۆ هێنانەوە.

گریمان من خۆم خستە ئەو کاتەی موحەممەد (ﷺ)ی تێدا ژیاوە، بەو زانیاریانەی کە هەتا ئەمڕۆ پێی گەیشتووم هەر بەو شێوەیە وەسفی شتەکانم دەکرد کە قورئان وەسفی کردوون. من شتێک نابینم، هۆکارێک نابینم، بەڵگەیەک نابینم بیر و بۆچوونەکانی موحەممەد (ﷺ) هەڵبوەشێنێتەوە، کە بێگومان دەبێ ئەو زانیاریانەی لە شوێنێکەوە وەرگرتبێت. لەبەرئەوە هیچ دژایەتییەک نابینم لەگەڵ ئەو بۆچوونەی کە وەسفە خواییەکە بە شێوەیەکی گشتگیری هەموو ڕووەکانی گرتووەتەوە".

شێخ زندانی:

ئەمە پرۆفیسۆر (مارشاڵ جۆنسن)ە، کە سەرەتا بە پەرچدانەوەی وتەکانمان دەستی پێ کرد، بەڵام بەو جۆرە کۆتایی پێ هات کە لە چەندین کۆنگرەدا ئەم توێژینەوانەی پێشکەش بکات.

کاتێک پرسیار لە ڕای ئەو دەربارەی تەفسیری ئەم دیاردەیە لێ کرا، دیاردەی ئەوەی کە زانست دەریخستووە و لە قورئان و سوننەتیشدا هاتووە، وەڵامی دایەوە و وتی:

بەڵێ، بێگومان ئەمە نیگایە.

بەڵێ هیچ ڕێگایەک لە بەردەم مرۆڤایەتیدا نەماوە تەنها ئەوە نەبێت کە وەک ئەم زانایانە دان بنێن بەو ڕاستییەی کە پەروەردگار پەڕتووکێکی بە زانستی خۆی بۆ موحەممەد (ﷺ) نیگا کردووە و بەڵێنی بە مرۆڤایەتیش داوە کە بە درێژایی کاروانەکەی، ڕاستی وا لە قورئان دەربکەوێت کە ببێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەم قورئانە پیرۆزە لەلایەن خوای گەورەوەیە، وەک دەفەرموێت:

﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ (٨٨) ﴾ ص.

واتە: "لەمەولا هەواڵ و پەیامی قورئان دەزانن".

هەروەها دەفەرموێت:

﴿لِكُلِّ نَبَإٍ مُسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ (٦٧)﴾ الأنعام.

واتە: "بۆ هەموو هەواڵێک کاتێکی دیاری کراو هەیە کە ڕاستییەکەی دەربکەوێت و لە دوایدا دەیزانن".



جارێکی تر دەفەرموێت:

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٥٣)﴾ فصلت.

واتە: "لە داهاتوودا بەڵگەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین لە ناو ئاسۆکانی گەردووندا و لە خودی خۆیشیاندا، تا بۆیان ڕوون ببێتەوە قورئان هەقە و لەلایەن خوداوە هاتووە. ئایا پەروەردگارت بەس نییە بەوەی کە بە ڕاستی ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا".



# کۆرپەلە لە دوای چل و دووهەم ڕۆژ



شـێخ زندانـی: "ئەمـە (پڕۆفیسـۆر تـی ڤـی ئێـن پێرسـاد)ە سـەرۆکی بەشـی توێکاریـی کۆلێـژی پزیشـکییە لـە مانیتۆبـای کەنـەدا".



T.V.N. Persaud; Professor of Anatomy and Professor of Paediatrics and Child Health University of Manitoba, Winnipeg, Manitoba, Canada.

دکتۆر (کیس مۆر) ئەم زانایەی پێ ناساندین. (دکتۆر مۆر) وتی: "چەند زانایەکی ئازاد هەن مەبەستیان گەڕانە بە دوای ڕاستیدا ئەمە یەکێکیانە".

(پرۆفیسۆر تی ڤی ئێن پێرساد) دانەرێکی بە ناوبانگە و چەندین کتێبی لە بواری زانستی نەخۆشییەکانی ئافرەتدا داناوە.

ئەم زانایە چەندین ئاماژەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری بۆ کتێبەکانی زیاد کرد و چەندین توێژینەوەی لە چەندین کۆنگرەدا پێشکەش کرد. یەکێک لەو توێژینەوانەی پێشکەشی کرد سەبارەت بە فەرموودەی پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ) کە موسلیم ڕیوایەتی کردووە و دەفەرموێت:

(إذا مر بالنطفة ثنتان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكا فصورها، وخلق سمعها وبصرها وجلدها ولحمها وعظامها، ثم قال يارب أذكر أم أنثى؟ فيقضي ربك ما شاء) رواه مسلم.



وەک دەیبینین، ئەمە وێنەی کۆرپەلەیەکە لە سی و پێنجەمین ڕۆژیدا. ناتوانین وێنەی مرۆڤی تێدا بەدی بکەین. هەروەها ئەم وێنەیەی تر کە دەیبینین وێنەی کۆرپەلەیەکە لە چل و دووهەمین ڕۆژیدا، وەک (پرۆفیسۆر تی ڤی ئێن پێرساد) دەڵێت: تا ئێستا شێوەی مرۆڤانەی تێدا نابینرێت. هەروەها ئەم وێنە ڕوون کراوەیەی تر کە (کۆمپانیای سیبا) لە هەمان ڕۆژ ـ واتە چل و دووهەم ڕۆژی کۆرپەلە ـ دا پێشکەشی پزیشکەکانی کرد.


لە هەمان ڕۆژواتە چل و دوهەم ڕوژی کورپەلەدا پیشکەشی پزیشکەکانی کرد

بەڵام دوای ئەوە ــ واتە دوای سی و پێنجەمین ڕۆژ ــ بە هەفتەیەک و لە ماوەی هەفتەی حەوتەمدا و بە تەواوی دوای چل و دوو ڕۆژ، وێنەکە بە تەواوی دەگۆڕێت و شێوەی ئادەمیی تێدا دەردەکەوێت:


وێنەکە بەتەواوی دەگۆڕێت وەك بە مجۆرە دەیبینین

فەرموودەکەی کە بیستمان پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (إذا مر بالنطفة ثنتان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكا فصورها، وخلق سمعها و بصرها وجلدها ولحمها وعظامها) .



"وەک بۆم باسکرا موحەممەد کەسێکی زۆر سادە و نەخوێندەوار بووە و نەیتوانیوە بخوێنێتەوە و بنوسێت. ئێمە باسی کەسێکی نەخوێندەوار دەکەین کە (١٤٠٠) ساڵە بە شێوەیەکی سەرسورهێنەر ئاماژە بە چەندین لێدوانی قوڵ و وردی زانستی دەدات. من وەکو خۆم ناتوانم بڵێم ئەمە رێکەوتە، چەندین شتی زۆر ورد وەک دکتۆر (کیس مور) وتی: هیچ قورسییەک لەوەدا نابینم کە بە ژێری خۆم ئەوە پەسەند بکەم کە ئەمە ئیلهامی خوداییە، یان نیگایەکە و بەم بەڵگە رۆشنانەی گەیاندووە".

پرۆفیسۆر پێرساد

(پرۆفیسۆر پێرساد) توێژینەوەی زۆری سەبارەت بە پەیوەندی قورئان و سوننەت بە زانستە نوێیەکانەوە پێشکەش کرد. یەکێک لەو توێژینەوانەی پێشکەشی کرد لەسەر واتای ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، کە دەفەرموێت:

(لم تظهر فاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها إلا فشى فيهم الطاعون والأوجاع التي لم تكن في أسلافهم) (رواه ابن ماجة الفتن باب٢٢، حديث ٩١٠٤، والحاكم ٤/٥٤٠ وصححه).

واتـــە: "هەرگیـــز داوێنپیســـی لـــە نەتەوەیەکـــدا بـڵاو نەبووەتـەوە و گەیشـتبێتە ئـەوەی بـە ئاشـکرا ئەنجامـی بدەن، مەگـەر چەندیـن نەخۆشـی کوشـندە و ئازاریـان تێـدا بـڵاو بووەتـەوە کـە لـە پێشـینەکانیاندا نەبـووە".

چەندیـن نەخۆشـی کوشـندە و ئـازار لـە هـەر نەتەوەیەکـدا بـڵاو بووەتـەوە کـە لـە پێشـینەکانیاندا نەبـووە هـەر کاتێـک داوێنپیسـی تیایانـدا بـڵاو بووبێتـەوە و بـە ئاشـکرا ئەنجامـی بـدەن.

ئـەوە (پرۆفیسـۆر پێرسـاد)ە ئـەو بەشـەی لێکۆڵینەوەکـەی ڕاڤـە دەکات:

"ئـەوەی ئێسـتا بـە شـێوەیەکی فـراوان دانـی پێـدا نـراوە ئەوەیـە کـە گۆڕانکارییـە مەترسـیدارەکانی ملـی منـداڵان پەیوەسـتە بـە تەمەنـی ئافـرەت و چـەن جـارەی سـێکس و چەنـد جـارەی منداڵبـوون.

زۆرێـک لـە لێکۆڵینـەوەی زانستی نەخۆشـییەکان، بـە ڕوونـی پەیوەنـدی هاوبـەش و گرنگـی نێـوان پەیوەندییـە سێکسـییە جۆراوجـۆرەکان و تووشـبوونی زۆر بـە شـێرپەنجە دەردەخـەن.

ئەنجـام و مەترسـییەکانی پەیوەندییـە سێکسـییە ناشـەرعییەکان و پیادەکردنـی لادانـە سێکسـییەکان (1400) سـاڵە لـەم فەرموودەیـەدا باسـکراوە، هیـوادارم ڕاسـت بـم.

داوێنپیسـی لـە هـەر نەتەوەیەکـدا بـڵاو نابێتـەوە و ئاشـکرای

ناکـەن مەگـەر نەخۆشـی کوشـندە و ئازارێـک کـە لـە پێشـینەکانیان نەبـووە، تیایانـدا بـڵاو دەبێتـەوە".

واتـای (فاحیشـە): خیانـەت و لادانـە سێکسـییە شـاراوە و ئاژەڵییـەکان و هەمـوو لادانـە سێکسـییەکانی تـرە.

لـە ئێسـتادا نەخۆشـی (ئایدن) و (هربـز) نموونـەی ڕوونـن لەسـەر ئـەو نەخۆشـییە نوێیانـە کـە تـا ئێسـتا چارەسـەرمان بۆیـان نییـە. زۆر سـوپاس بـۆ ئێـوە.

بڕوانـن بـۆ ئـەو پەیوەندییـەی فەرموودەکـەی پێغەمبـەر (ﷺ): (ومـا ظهـرت الفاحشـة فـي قـوم قـط حتـى يعلنـوا بهـا الا فشـى فيهـم الطاعـون والأوجـاع التـي لـم تكـن فـي اسـلافهم).

لەگـەڵ ئـەوەی ئەوروپـا و ئەمەریـکا لادانـی سێکسـی و داوێنپیسـی و بـەد ڕەوشـتییان بـە هەمـوو شـێوەکانییەوە حـەڵاڵ کـرد، دەبینیـن هـەر کـە ئاشـکرایان کـرد و بڵاویـان کـردەوە چەنـد سـاڵێکی نـەبرد ئـەو نەخۆشـییانەیان تێـدا بڵاوبـووەوە کـە قەوارەیانـی لەرزانـد.

پێغەمبـەر (ﷺ) ڕاسـتی فەرمـوو کـە ئەمانە نەخۆشـی نوێن. ئەوەتـا ئـەو نەخۆشـییە کوشـندانە بڵاوبوونـەوە و نەخۆشـی تریـش دێتـە ئـاراوە کـە لێـی دەترسـن.

(پرۆفیسـۆر پێرسـاد) هەوڵێکـی سوپاسـکراوی لـەم بـوارەدا هەیـە، کاتێـک دەربـارەی ئـەم دیاردەیـەی کـە بـە چـاوی خـۆی

بینیی و بە چەندین توێژینەوە بەشداری تێدا کرد پرسیاری لێکرا، وتی:

"وەک بۆم باسکرا موحەممەد کەسێکی زۆر سادە و نەخوێندەوار بووە و نەیتوانیوە بخوێنێتەوە و بنوسێت. ئێمە باسی کەسێکی نەخوێندەوار دەکەین کە (1400) ساڵە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ئاماژە بۆ چەندین لێدوانی قوڵ و وردی زانستی دەکات. من وەکو خۆم ناتوانم بڵێم ئەمە ڕێکەوتە، چەندین شتی زۆر ورد وەک دکتۆر (کیس مور) وتی: هیچ قورسییەک لەوەدا نابینم کە بە ژێری خۆم ئەوە پەسەند بکەم کە ئەمە ئیلهامی خودایییە یان نیگایەکە و بەم بەڵگە ڕۆشنانەی گەیاندووە".

شێخ زندانی: بێگومان ئەمە ئەو نیگایەیە کە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ موحەممەد (ﷺ) هاتووە، ئەو نیگایەی کە بە زانستی خودا دابەزیوە.

﴿ لَكِنْ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ .... (١٦٦)﴾ النساء.

واتە: "بەڵام خودا شایەتی ڕاستیی پێغەمبەرایەتی تۆ دەدات بەوەی قورئانی بۆ دابەزاندوویت و بە زانستی خودایی خۆی بۆی دابەزاندوویت".

بەڵێ... بێگومان ئەمە نیگایە، بەڵگەیەکی ئاشکرایە، هەتا ڕۆژی دوایی هەقێکە لەبەردەستماندا.

"لەبەرئەوەش کە پێغەمبەر (ﷺ) نەیتوانیوە بخوێنێتەوە و بنووسێت، بەمەش دەسەلمێت موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەرە و ئەم هەقیقەتانەی بۆ هێناوین، بێ شک لە ڕێی نیگا و لە بەدیهێنەری زانا بە هەموو شتەکانەوە بۆی نێردراوە، ئەو بەدیهێنەرەش تەنها هەر (الله)یە.

لەبەرئەوە باوەڕم وایە ئێستا کاتی ئەوەیە شایەتی بدەم و بڵێم:

أَشْهَدُ أَنّ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا الله وأَشْهَدُ ان محمداً رسول الله"

پڕۆفیسۆر تیجەتات تیجسن

ئەمە (پرۆفیسۆر تیجەتات تیجسن)ە سەرۆکی بەشی توێکاری و کۆرپەلەزانییە لە زانکۆی (شاینگ مای) تایلاند، پێشتر ڕاگری کۆلێژی پزیشکی بوو لە هەمان زانکۆ.




Professor Tejatat Tejasen Chairman of the Department of Anatomy and is the former Dean of the faculty of Medicine, University of Chiang Mai, Chiang Mai, Thailand.

سەرەتای پەیوەندیمان لەگەڵ (پرۆفیسۆر تیجەتات تیجسن) بەوە بوو کە هەندێ ئایەت و فەرموودەمان پیشاندا کە پەیوەستبوون بە پسپۆڕی توێکارییەکەیەوە.

لە وەڵامدا وتی: "ئێمەش لە پەرتووکە پیرۆزەکانی (بوزی)ماندا وەسفی ورد لە سەر قۆناغەکانی کۆرپەلە هەیە. ئێمەش وتمان: زۆر پەرۆشین ئەو وەسفانە بزانین و دەمانەوێت نووسینی ئەو پەرتووکانە ببینین. ئەویش بەڵێنی ساڵێکی تری پێدایین. بەڵام دوای ساڵێک کاتێک هاتەوە بۆ تاقیکردنەوەی دەرەکی قوتابییەکانی کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی (مەلیک عەبدولعەزیز) پرسیارمان لێکردەوە".

داوای لێبوردنی کرد و وتی: "ئەو کاتە وەڵامم دانەوە بە بێ ئەوەی لێی دڵنیابم، بەڵام کە لێم کۆڵییەوە بۆم دەرکەوت دەقی لەو جۆرەی باسم کرد تێدا نییە".

لەو کاتەدا موحازەرەیەکی نووسراوی دکتۆر (کیس مۆر)مان پێشکەش کرد کە ناونیشانی موحازەرەکە (هەماهەنگیی کۆرپەلەزانی لەگەڵ قورئان و سوننەتدا) بوو.

لێمان پرسی: ئایا پرۆفیسۆر (کیس مۆر) دەناسیت؟

وتی: بێگومان ئەو پیاوێکە لە گەورە زانا بەناوبانگەکانی جیهان لەو بوارەدا.

دوای ئـەوەی موحازەرەکـەی بینـی سەرسـام بـوو. ئێمـەش چەنـد پرسـیارێکمان لـە بـواری پسـپۆرییەکەی خۆیـدا لێکرد و، لەوانـەش کـە پەیوەنـدی بـە پێسـتەوە هەبـوو.

ئایا سـوتانی پێسـت بـە ئاگـر کاردەکاتـە سـەر نەهێشـتنی هەسـتکردن بـە ئـازار؟

لــە وەڵامدا (پرۆفیسـۆر تیجاتــات تیجاسـن) وتــی: "بەڵــێ ئەگـەر سـووتانەکە قـوڵ بێـت و کۆئەندامـی هەسـتکردن بـە ئـازار لـە نـاو ببـات".

ئایـا گرنگـە بەلاتــەوە بزانــی کــە لــە پەڕتووکــی پیــرۆزی قورئانـدا (1400) سـاڵە ئامـاژە دراوە بـەوەی سـزای بێباوەڕان لـە ئاگـری دۆزەخ بەوەیـە کاتێـک پێسـتەکانیان دەسـووتێت پـەروەردگار پێسـتی نوێیـان بـە بـەردا دەکاتــەوە تـا سـزای ئاگرەکـە بـەردەوام بچێـژن. کـە ئەمـە ئاماژەیـە بـەو ڕاستییەی کـە هەسـتە دەمـارەکان لـە نـاو پێسـتدان.






درێـــژه برگەیـــەک لـــە پێســـتدا کۆتاییـــە دەمـــارەکان کـــە هەســـتکردن بـــە ئـــازار و گەرمـــی دەگوێزنـــەوە لـــە چینـــی بـــن توێـــژی پێســـتدا دەردەکەوێـــت.

دەقی ئایەتەکەش ئەمەیە:

﴿إِنَّ الَّذِيـنَ كَفَـرُوا بِآيَاتِنَـا سَـوْفَ نُصْلِيهِـمْ نَـاراً كُلَّـمَا نَضِجَـتْ جُلُودُهُـمْ بَدَّلْنَاهُـمْ جُلُـوداً غَيْرَهَـا لِيَذُوقُـوا الْعَـذَابَ إِنَّ اللَّـهَ كَانَ عَزِيـزاً حَكِيـماً (٥٦)﴾ النسـاء.

واتـە: "ئەوانـەی کافـرن بـە ئایەتەکانـی ئێمـە، دەیـان خەینـە ئاگـرەوە، جـا هـەر کات پێسـتەکانیان تـەواو سـووتا خێـرا پێسـتی تریـان بـە بـەردا دەکەیـن تـا بـەردەوام سـزا بچێـژن، بێگومـان پـەروەردگار بـە هێـز و دانایـە".

ئایا لەگەڵ ئەوەیت کە ئەمە ئاماژەیە بە گرنگی کۆتایی هەستە دەمارەکان لە پێستدا کە پێش (1400) ساڵ باسکراوە؟

بەڵێ لەگەڵ ئەوەم کە ئەمە زانیاری هەستە دەمارەکانە لە پێستدا و لە زوودا باسکراوە.

چونکە باسی ئەوە دەکات ئەو تاوانبارانەی بە سووتان سزا دەدرێن، ئەگەر پێستەکانیان سووتا پێستی تریان بە بەردا دەکرێتەوە تا بەردەوام سزا بچێژن.

ئەمە واتای ئەوەیە پێش (1400) ساڵ باس لەوە کراوە کە هەستکردن بە ئازار لە پێستدایە لەبەرئەوە پێویستە پێستی نوێیان بە بەردا بکرێتەوە.

بێگومان پێست ناوەندی هەستکردنە بە ئازار، ئەگەر پێستەکە هەمووی بە ئاگر سوتا، هەستکردن بە ئازار نامێنێت.

لەبەرئەوە پەروەردگار سزای بێباوەڕان لە ڕۆژی دواییدا دەدات ئەویش بە نوێکردنەوەی پێستەکانیان جار لە دوای جار. وەک دەفەرموێت:

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَاراً كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُوداً غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ ....(٥٦)﴾ النساء.

بـەو جـۆرە چەنديـن ئايـەت و فەرموودەمـان بۆ (پرۆفيسـۆر تيجاتـات تيجاسـن) بـاس كـرد و پاشـان پرسـيمان: ئايـا دەگونجێـت ئـەو زانياريانـە لـە سـەرچاوەيەكى مرۆييـەوە بـۆ موحەممـەد (ﷺ) هاتبـن؟

لە وەڵامدا وتى: ناگونجێت شتى وا بێت.

وتمان: ئەى لە كوێوە هاتووە؟

وتـى: "ناگونجێـت لـە سـەر چـاوەى مرۆييـەوە بێـت، بـەڵام ئـەو پرسـيارە مـن ئاراسـتەى ئێـوەى دەكەمـەوە ئايـا موحەممـەد ئـەو زانياريانـەى دەبێـت لـە كوێـوە وەرگرتبێـت؟ ئێمـەش پێمـان وت: لە (الله)ەوە (سـبحانه وتعالـى). پێـى وتين: (اللـه) كێيـە؟ وتمـان: بنياتنـەرى ئـەم بوونەوەرەيـە. گـەر دانايـى ببينـى، ئـەوا بەڵگـەى يەكێكـى كار بەجـێ و دانايە (الحكيـم)، گـەر لـەم بوونـەوەرەدا زانستت بينـى بەڵگەى بـە ديهێنەرێكـى زانايە (العليـم)، گـەر شـارەزاييت بينـى لـە پێكهاتنـى دروسـتكراوەكاندا بەڵگـەت دەداتـێ كـە ئـەوە كارى شـارەزايە (الخبير)، وە ئەگـەر بەزەييـت بينى شـايەتيت دەداتێ كـە ئـەوە لـە كارى بـە بەزەييە (الرحيـم) و بـەو جـۆرە، گـەر ڕێكخسـتن و يـەك سيسـتەمى و پەيوەنـدى پتـەوى بوونـەوەرت بينـى بەڵگـەت دەداتـێ كـە ئـەوە لـە كارى بەديهێنەرێكـى تـاك و تەنهايـە".

(دکتۆر تیجاتات) دانی بە هەموو ڕاستییەکاندا نا. پاشان گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی و زنجیرەیەک وتاری لەو دیاردانەی کە فێریان بووبوو پێشکەش کرد. دواتر پێمان گەیشت لە دوای وتارێکی، پێنج لە قوتابییەکانی موسڵمان بوون.

لە ئەنجامدا دانی بەو شتانەدا نا کە وتمان.

پاشان وادەی کۆنگرەی پزیشکیی هەشتەمی سعودی هات. کۆنگرەکە لە هۆڵێکی گەورەدا سازدرا و، باسەکانی تایبەت بوو بە ئیعجازی پزیشکیی قورئان و سوننەت. چوار ڕۆژ چەندین پرۆفیسۆری موسڵمان و ناموسڵمان گوێبیستی بابەتەکان بوون. لە کۆتایی کۆنگرەکەدا (پرۆفیسۆر تیجاتات تیجاسن) هەستا و ئەم وتانەی پێشکەش بە ئامادەبووان کرد:



"In the last three years I became interested in the Quran... From my study and what I have learned throughout this conference، I believe that everything that has been recorded in the Quran fourteen hundred years ago must be the truth، that can be proved by the scientific means. Since the Prophet Muhammad could neither read nor write، Muhammad must be a messenger who relayed this truth which was revealed to him as an enlightenment by the One who is eligible Creator of all. This Creator must be God or Allah.

I think this is the time to say La ilaha illa Allah، there is no god to worship except Allah (God), Muhammad rasoolu Allah. Muhammad is Messenger of Allah...

The most precious thing I have gained from coming to this conference is La ilaha illa Allah and to have become a Muslim.

قورئانــه پیــرۆزه بــووم کــه (شــێخ عەبدولمەجیــد زندانــی) لــه چاوپێکەوتنــی پێشــوودا پێــی دام، هەروەهــا خەریکــی موحازەرەکانــی (پڕۆفیســۆر کیــس مــور) بــووم کــه (شــێخ زندانــی) داوای لێکــردم بــۆ زمانــی تایلانــدی وەری بگێــڕم و هەنــدێ وتــار لــەو بارەیــەوە بــۆ موســڵمانی تایلانــد بــدەم، منیــش داواکەیــم جێبەجــێ کــرد.

دەتوانن ئەو وتارانەی داومە لەم کاسێتەدا ببینن.

بــە ڕاســتی مــن بــاوەڕم وایــە هەمــوو شــتێکی قورئــان کــە (1400) ســاڵە باســی کــردووە، هــەر دەبێــت ڕاســتەقینە بــن و ئەمڕۆ دەتوانرێت بــە هــۆکارە زانســتییەکان ئاشــکرا بکرێــن. لەبەرئــەوەش کــە پێغەمبــەر (ﷺ) نەیتوانیــوە بخوێنێتــەوە و بنووسێت، بەمەش دەسەلمێت موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەرە و ئــەم هەقیقەتانــەی بۆ هێناوین، بــێ شــک لــە ڕێــی نیــگا و لــە بەدیهێنــەری زانــا بــە هەمــوو شــتەکانەوە بــۆی نێــردراوە، ئــەو بەدیهێنــەرەی کــە هــەر (الله)یــە.

لەبەر ئەوە باوەڕم وایە ئێستا کاتی ئەوەیە شایەتی بدەم و بڵێم:

"أَشْهَدُ أَنّ لَّا إِلَهَ إِلَّا الله وأَشْهَدُ ان محمداً رسول الله".

لە کۆتاییدا پێویستە سوپاستان بکەم لەسەر ئەو هەوڵانەی داوتانە بۆ ئامادەکردنی ئەم وتووێژانە، کە بە پلەیەکی بەرز سەرکەوتنی بە دەست هێنا. هەرچەندە ئامادەکردنی برگەکانی بابەتەکە لەم کۆنگرەیەدا بەم قەبارەیە گران بوو بۆم، بەڵام من تەنیا لایەنە زانستییەکەیم بە لاوە گرنگ نییە، بەڵکو ئەو ئاواتە گەورەیەشم هاتە دی کە سەردانی کردنی زانایانە و دروست کردنی هاوڕێیەتییە لە گەڵیاندا. بە نرخترین شتێکیش کە بە پەیڕەوکردنی ئەم بیروباوەڕە بە دەستم هێناوە (لَّا إِلَـهَ إِلَّا اللـه وأَشْـهَدُ ان محمـداً رسـول الله) یە، کە پێی بوومەتە موسڵمان.

خاوەنی ئەم وتەیە ڕاستی فەرمووە:

﴿وَقُلْ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ (٩٣)﴾ النمل.

واتە: "بڵێ: سوپاس بۆ پەروەردگار کە ئایەتەکانی خۆیتان لە داهاتوودا نیشان دەدات و ئەوکاتە دەیناسنەوە کە ئەمانە ئایەتەکانی خودان".

"به ڕاستی دەرخستنی ڕاستییەکان لە قورئانی پیرۆزدا زۆر کاریان تێکردم. بە ڕاستی قورئانی پیرۆز لە بەرزترین خاڵی ئەم بونەوەرەوە وەسفی گەردوون دەکات".

پرۆفیسۆر یوشیودی کۆزان



پرۆفیسۆر یوشودی کوزان

به ڕاستی دەرخستنی ڕاستییەکان له قورئانی پیرۆزدا زۆر
کاریان تێکردم (کۆزان)

(I am very much impressed by finding true astronomical facts in the Quran).

ئـەم زانایـە بـە زمانـی بنەڕەتـی خـۆی (زمانـی یابانـی) دەدوێـت، ئەمـە پرۆفیسۆر (یوشـودی كـوزان)ە، بەڕێوەبـەری پێگـەی فەلەكیـی تۆكیۆیـە.

Pr. Yushudi Kuzan is Professor Emeritus at Tokyo University, Hongo، Tokyo, Japan and was the Director of the National Astronomical Observatory, Mitaka, Tokyo, Japan.

چەنـد ئایەتێكـی قورئانمـان پیشـانی ئـەم زانایـە دا كـە پەیوەسـت بوو بە وەسـفی ئاسـمان و سـەرەتای دروستبوونی و پەیوەنـدی زەوی بـە ئاسـمانەوە. كاتێـك واتـای ئایەتەكانـی خوێنـدەوە پرسـیاری كاتـی دابەزینـی قورئانـی لـێ كردیـن؟ ئێمـەش وەڵامـان دایـەوە كـە (1400) سـاڵە دابەزیـوە. دواتر ئێمـەش چەنـد پرسـیارێكمان لـێ كـرد لـە بـارەی ئـەو ڕاسـتییە گەردوونییانـەی ئایەتـی قورئانیـان لەسـەرە، ئەویـش وەڵامـی داینـەوە، بـەڵام لەگـەڵ وەڵامـی هەرپرسـیارێك، دەقێكـی قورئانیمـان پیشـان دەدا سـەبارەت بـەو وەڵامـەی ئـەو.

هەتا گەیشتە ئەوەی سەرسوڕمانی خۆی دەربڕی و، وتی:

"بە ڕاستی قورئانی پیرۆز لە بەرزترین خاڵی ئەم بونەوەرەوە وەسفی گەردوون دەکات، چونکە ئەو هەموو شتەکان لە بەردەمیدا ڕۆشنن. ئەوەی ئەم قورئانەی وتووە هەموو شتەکان لە گەردووندا دەبینێت و، هیچ شتێکی لە لا شاراوە نییە".

پرسیارمان لێ کرد لەو ماوە زەمەنییەی کە بەسەر ئاسماندا ڕۆشتووە و، ئەو کاتەی لە دۆخی دووکەڵدا بووە، وەڵامی داینەوە و وتی:

بێگومان بەڵگەکان هێندە زۆربوون لە ئێستادا ئەمە بووەتە شتێکی بینراو. ئێستا ئەستێرە لە ئاسماندا دەبینین لەو دووکەڵانەوە کە بنەڕەتی گەردوونن دروست دەبن، وەک لەم وێنەیەدا دەیبینین:



زانـاکان لـەم کۆتاییانـەدا دوای ئـەوەی کەشـتییە ئاسمانییەکانیان هەڵـدا ئـەم وێنەیەیـان دەسـت کـەوت. وێنـەی ئەسـتێرەیەک لـە ئەسـتێرەکانی گرتـووە کـە لـە دووکەڵـەوە دروسـت دەبێـت. تەماشـای لێـوارە سـورەکانی دووکەڵەکـە بکـە دەبینـی لـە سـەرەتای کۆبوونـەوە و بەیەکدالکانـن. هەروەهـا سـەیری ناوەڕاسـتەکەی بکـە، ماددەکان تیایـدا چڕ بوونەتـەوە و بوونەتـە شـتێکی بینـراو، بـە هەمـان شـێوەش ئەسـتێرە درەوشـاوەکان پێشـتر دووکـەڵ بـوون، بەڵکـو گـەردوون هەمـووی دووکـەڵ بـووە.

ئینجا ئەم ئایەتەمان پیشان دا کە دەفەرموێت:

﴿ثُـمَّ اسْـتَوَى إِلَى السَّـمَاءِ وَهِـيَ دُخَـانٌ فَقَـالَ لَهَـا وَلِـلأَرْضِ ائْتِيَـا طَوْعـاً فَقَـالَ لَهَـا وَلِـلأَرْضِ ائْتِيَـا طَوْعـاً أَوْ كَرْهـاً قَالَتَـا أَتَيْنَـا طَائِعِـينَ (١١)﴾ فصلـت.

واتـە: "لـە پاشـان پـەروەردگار ڕووی کـردە ئاسـمان لـە کاتێـکدا کـە دووکـەڵ بـوو، ئنجـا بـە ئاسـمان و بـە زەوی فەرمـوو: بـە ویسـتی خۆتـان یـا بـە ناچـاری وەرنـە ژێـر فەرمانـم، هەردووکیـان وتیـان بـە ویسـتی خۆمـان هاتیـن".

هەندێـک لـە زانـاکان کـە بـاس لـەم دووکەڵـە دەکـەن، دەڵێـن ئـەوە تـەم (ضـباب)ە.

پرۆفیسـۆر (یوشـودی کـوزان) ڕوونـی کـردەوە کـە زاراوەی تـەم (ضـبـاب) لەگـەڵ وەسـفی ئـەم دووکەڵـەدا ناگونجێـت، چونکـە تـەم سـاردە، بـەڵام دووکەڵ شـتێک لـە گەرمـی تێدایە،

هەروەها دووکەڵ بریتییە لە گاز کە ماددەی ڕەق و تاریکی تێدایە. بێگومان سەرەتای دروستبوونی ئەستێرەکانیش گاز بوون کە مادده ڕەقەکان تیایدا هەڵواسرابوون، لەگەڵ ئەوەشدا تاریک و گەرم بوون. ئەمەش بەسەر زاراوەی تەمدا ناگونجێت. بەڵکو وردترین وەسف ئەوەیە کە بڵێین دووکەڵ بووە.

بەو جۆرە ئەو ئایەتانەی پیشانی دەدرا و ئەویش ڕوونی دەکردنەوە.

لە کۆتاییدا پرسیارمان لێ کرد: "ڕات لە بەرامبەر ئەم دیاردەیە کە بۆ خۆت بینیت چییە؟ زانست بە پێشکەوتنەکانی خۆی نهێنییەکانی گەردوون دەردەخات کە زۆرێک لەو نهێنییانە لە قورئانی پیرۆز یان سوننەتی پاکدا باس کراون، ئایا گومان دەبەیت قورئانی پیرۆز لە سەرچاوەیەکی مرۆییەوە بۆ موحەممەد (ﷺ) هاتبێت؟".

شێخ زندانی: پرۆفیسۆر گوتی: "وەک بینیمان، نەخێر.. نەخێر.. ناگونجێت لە سەرچاوەی مرۆییەوە بێت".

پاشان وتی:

(I am very much impressed by finding true astronomical facts in the Quran For us the modern astronomers have been studying very small pieces of the universe. We've concentrated our efforts for understanding for a very small part. Because by using telescopes, we can see only very few parts of the sky without thinking about the whole universe. So, by reading the Quran and by answering to the questions, I think, I can find my future way for investigation of the universe.)

"بە ڕاستی دەرخستنی ڕاستییەکان لە قورئانی پیرۆزدا زۆر کاریان تێکردم. لە پێش ئێمەدا زانا فەلەکییە هاوچەرخەکان، لێکۆڵینەوەیان لە بەشە بچووکەکانی ئاسمان دەکرد، هەموو تواناکانمان لە تێگەیشتنی ئەو بەشە بچووکانەدا چڕ دەکردەوە، لەبەرئەوەی ئێمە بە هۆی تەلیسکۆبەکانەوە تەنیا بەشە سەرەکییەکانی ئاسمان دەبینین، لەبەرئەوە بە خوێندنەوەی قورئان و وەڵام دانەوەی

پرسـیارەکان بـڕوام وایـە دەتوانـم لـە داهاتـوودا ڕێگایەکـی نـوێ بـۆ لێکۆڵینـەوە لـە گـەردوون بدۆزمـەوە".

هـەروەک بینیمـان (پرۆفیسـۆر) وتـی: "نەخێـر ناگونجێـت لـە سـەرچاوەی مرۆییـەوە بێـت، هەروەهـا وتـی: ئێمـە وەک زانـاکان هەمیشـە لەسـەر بەشـێکی بچووک لێکۆڵینەوەکانمـان چـڕ دەکەینـەوە، بـەڵام ئـەو کەسـەی قورئـان دەخوێنێتـەوە، وێنەیەکـی فـراوان تـری گـەردوون دەبینێـت".

هەروەهـا وتـی: "بێگومـان مـن فێـری بەرنامەیەکـی نـوێ بـووم، بـۆ لێکۆڵینـەوە لـە گـەردوون، کـە پێویسـتە بـە ڕوانینێکـی گشـتگیرانە بـۆی بڕوانیـن، نـەک لـە خاڵێکـی بچـووک و لاوەکـی و دیاریکـراوەوە".

وتـی: "بێگومـان مـن ئـەم پرۆگرامـە دادەنێم کـە دوای ئەوەی قورئانـی پیـرۆزم خوێنـدەوە و فێـری بـووم. لەبەرئـەوە بـە هـۆی ئـەو ئایەتانـەی پەیوەسـتن بـە گەردوونـەوە داهاتـووی خـۆم زانـی. واتـە: لەمـەودوا بـەو ڕوانینـە گشـتگیرییانەوە کـە لـە پەڕتووکـی خـوداوە سـوودمەند بـووم، بەرنامـە بـۆ لێکۆڵینەوەکانـی داهاتـووم دادەنێـم".

پاکـی و بێ گـەردی بۆ تۆیـە خوایـە.. ئا ئەمانـە زاناکانـی خۆرهـەڵات وخۆرئـاوان، سـەریان لەبـەردەم گەورەیـی ئـەم کتێبـە پیـرۆزە نـەوی دەکـەن.

ئەمەیە بەڵگەی پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ)، ئەمەیە موعجیزەی هەمیشەیی و نوێبوەوەی، ئەمە ئەو موعجیزە زیندووەیە کە موسڵمان و ناموسڵمان و گشت نەوەکان تا ڕۆژی دوایی قایل دەکات.

﴿لَكِنْ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ.... (١٦٦) ﴾ النساء.

﴿وَقُلْ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا و....(٩٣)﴾ النمل.



"بێگومان زۆر لەو باسانەی لەو کاتانەدا باس کراون، لە
تواناندا نەبووە بسەلمێنرێن، بەڵام لە ئێستادا بە هۆکارە
زانستییە تازەکان دەتوانرێت ئەوانەی موحەممەد (ﷺ) 1400
ساڵە وتوویەتی بسەلمێنرێن".

پرۆفیسۆر ئەلفرێد کرۆنەر



ئـەم وتووێـژە لێدوانەکانی (پڕۆفیسـۆر ئەلفرێـد کرۆنـەر)ی لـە خۆگرتـووە سـەبارەت بـە ئامـاژە قورئانییـەکان بۆ زەویناسـی و پێکهاتنی تــەنە گەردوونییەکان.

lfred Kroner; Professor of the Department
Geosciences, University of Mainz, Germany.

شـێخ عەبدولمەجیـد زندانـی: ئەمە (پرۆفیسـۆر ئەلفرێـد کرۆنـەر)، لـە بەناوبانگترینـی زاناکانی (زەوی ناسـی-جیۆلۆجیا) یە لـە جیهانـدا. لـە نێـو زاناکانـدا بـە ڕەخنەگرتـن بـە ناوبانگـە لـە تیـۆری گـەورە زاناکانـی تـری جیۆلۆجیـا.

پێـی گەیشـتین و چەنـد ئایـەت و فەرموودەیەکـی پێغەمبـەر (ﷺ)مـان پیشـاندا، ئەویـش وەڵامـی دایـەوە و وتووێژمـان دەربارەیـان کـرد.

وتـی: "تێڕامـان لـە زۆرێـک لـە مەسـەلە جیۆلۆجییـەکان و پێکهاتنـی تەنـە ئاسـمانییەکان، وامـان لێدەکات دڵنیـا بیـن کە ئەسـتەمە ئـەو زانیارییانـە (موحەممـەد) لـە خـودی خۆیـەوە یـان لـە زانیـاری سـەردەمەکەیەوە وەریگرتبـن. چونکـە ئـەو زانیارییانـە زانـاکان لـەم چەنـد ساڵەی دواییدا نەبێـت کـە بـە هـۆکار و تەکنۆلۆژیـای زۆر ئاڵـۆز و پێشـکەوتوو دەریانخسـت، نەزانرابـوون، ئـەی لـە کوێـوە هێناویەتـی؟".

لێـرەدا پرۆفیسـۆر کرۆنـەر نموونەیەکـی هێنایـەوە بـۆ بەڵگـەی ئـەوەی کـە ئەسـتەمە قورئـان وتـەی موحەممـەدی نەخوێنـدەوار (ﷺ) خـۆی بێـت.

ئـەو ئایەتـە قورئانییـەی بـە نموونـە هێنایـەوە کـە بـاس لـە یـەک پارچەیـی دروسـتبوونی گـەردوون دەکات لـە سـەرەتادا

لە وتەی پەروەردگار:

﴿أَوَلَمْ يَرَى الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنْ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ..... (٣٠)﴾ الانبياء.

واتە: "ئایا بێ بڕواکان نەیان بینیوە کە ئاسمانەکان و زەوی هەردووکیان پێکەوە لکابوون، یەک پارچە بوون و لە یەکتریمان جیاکردنەوە و، لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێنا".

(كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا) وەک (عەبدوڵڵای کوڕی عەباس) و (موجاهید) و جگە لەوان (خوا لێیان ڕازی بێت) دەڵێن: (كانتا ملتزقتين أو ملتصقتين ففصلتا)، واتە: "سەرەتا ئاسمانەکان و زەوی پێکەوە بوون و لە یەکتری جیا کرانەوە".

(پرۆفیسۆر کرۆنەر) ئەم ئایەتەی بە نموونە هێنایەوە کە هەرگیز ناگونجێت ئەو زانیارییانە هی خودی (موحەممەد) خۆی بێت، نەک هی ئەو، بەڵکو ناگونجێت هی مرۆڤایەتی ئەو سەردەمەش بووبێت.

پرۆفیسۆر کرۆنەر لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو، وتی:

"کەسێک 1400 ساڵ بەر لە ئێستا هیچ زانیارییەکی دەربارەی فیزیایی ناوکی نەبێت، بە بڕوای من، هەرگیز ناتوانێت بە ژیری خۆی درک بەو زانستە بکات و باس لە زەوی و ئاسمانەکان بکات کە هەمان بنەڕەتیان هەبووە،

یـان زۆر لـه بابەتەکانـی دیکـه کـه وتووێژمـان لەسـەر کـرد".

شـێخ زندانـی: (پرۆفیسـۆر کرۆنـەر) سـەرەتا هیـچ بوارێکـی بـۆ ئێمـه نەدەهێشـتەوە ئەگـەر بـەس بوارێکـی هەڵهاتنـی هەبوایـه لێمـان هەڵدەهـات، نموونەیـەک لەسـەر ئـەوە دێنمەوە.

ئێمـه وتووێژمـان لەسـەر ئـەوە بـوو کـه وڵاتـی عـەرەب لـه دێرزەمانـەوە چـۆن بـووە؟

لێمـان پرسـی: ئایـا نیشـتمانی عـەرەب بێسـتان و ڕووبـار بـووە؟

له وەڵامدا وتی: بەڵێ.

وتمان: کەی بەو جۆرە بووە؟

وتـی: "لـه سـەردەمی چاخـی بەفریـن کـه بەسـەر زەویـدا ڕۆشـتووە، بەسـتەڵەک لـه جەمسـەری بەسـتووی باکـووردا کەڵەکـه بـووە پاشـان بـەرە و باشـوور دەکشـێت، کاتێـک بـه نزیکەیـی لـه دوورگـەی عەرەبـی نزیـک بێتـەوە، کـەش و ئاووهـەوای ئـەو ناوچەیـە دەگۆڕێـت، بـەوەش وڵاتـی عـەرەب لـه هەمـوو شـوێنێکی تـر زیاتـر دەبێتـه بێسـتان و ڕووبـار و بـاران".

پێمـان وت: "ئایـا زێـدی عـەرەب دەبێتـەوە بـه بێسـتان و ڕووبـار؟ وتـی: بەڵـێ، ئـەوە ڕاسـتییەکی زانسـتییە".

سەرمان سوڕما چۆن لەگەڵ ئەوەی ئەو زانیارییە پەیوەندی بە داهاتووەوە هەیە و دەڵێت ڕاستییەکی زانستییە، لێمان پرسی بۆچی؟

وتی: "چونکە چاخی بەفرین دەستی پێکردووەتەوە، ئەو بەستەڵەکانە جارێکی تر لە جەمسەری بەستووی باکوور بەرەو باشوور دەکشێنەوە و لە ڕێگاکەیشیدا لە ناوچە نزیکەکانی وڵاتی عەرەب نزیک دەبنەوە".

پاشان وتی: "بێگومان بەڵگەشمان ئەو زریان و گەردەلوولە بەفراوانیانەیە کە دەبیستین هەموو زستانێک لەسەر شارە باکوورەکانی ئەورووپا و ئەمریکا دەدات. ئەمەش بەڵگەی زاناکانە لەسەر ئەوە و چەندین بەڵگەی تریان بە دەستەوەیە کە ئەوە ڕاستییەکی زانستییە".

ئێمەش پێمان وت: ئەوەی تۆ باسی دەکەیت لە دوای چەندین هەوڵی درێژ خایەن و بەکارهێنانی ئامێری ورد نەبێت زاناکان نەیان توانی بیزانن، بەڵام دەبینین کە لەسەر زمانی موحەممەد، پێغەمبەری نەخوێندەوار (ﷺ) پێش 1400 ساڵە باسکراوە.



لـه فەرموودەیەکـدا کـە پێشـەوا (موسـلیم) گێڕاویەتـەوە، دەفەرموێـت (ﷺ):

(لا تقـوم السـاعة حتـى تعـود أرض العـرب مروجـا وأنهـارا)، واتـە: "قیامـەت هەڵناسـێت تـا خاکـی عـەرەب جارێکـی تـر نەبێتـەوە بـە بێسـتان و ڕووبـار".

پێمـان وت: ئایا کـێ بـە موحەممـەد (ﷺ)ی وت کـە وڵاتـی عـەرەب بێسـتان و ڕووبـار بـووە؟

دەست بەجێ وەڵامی دایەوە: لە ڕۆماندا نووسراوە.

لەویـا بیـرم لـە توانـای خـۆ ڕزگارکردنـی کـردەوە لـەو تەنگەبـەرەی تێـی کەوتـوە، بۆیـە وتمـان کەواتـە پرسـیارێکی تـری بـەرەو ڕوو دەکەینـەوە.

پێمـان وت: "ئـەی کـێ هەواڵـی پـێ دا کـە لـە داهاتـوودا دووبـارە دەبێتـەوە بـە بێسـتان و ڕووبـار؟".

بێگومـان ئەگـەر بوارێکـی هەڵهاتنـی بدۆزیایەتـەوە هەڵدەهات لێمـان. بـەڵام کـە هەقیقەتەکـەی بینـی بوێـر بـوو و بـە ڕاشـکاوانە ڕای خـۆی ئاشـکرا کـرد و وتـی: بێگومـان ئەمـە بـە نیـگا لـە سـەرەوە نەبێـت هەرگیـز نابێـت.

لە دوای چەند وتووێژمان لەگەڵیدا بەم جۆرە دوا:

Professor Alfred Kroner If you combine all these and you combine all these statements that are being made in the Quran in terms that relate to the earth and the formation of the earth and science in general, you can basically say that statements made there in many ways are true. They can now be confirmed by scientific methods، and in a way, you can say that the Quran is a simple science text book for the simple man. and that many of the statements made in there at that time could not be proven, but that modern scientific methods are now in a position to prove what Muhammad said 1400 years ago.

پرۆفیسۆر كرۆنەر: بڕوام وایە گەر هەموو شتەكان و گشت بابەتەكانی قورئان كۆ بكەیتەوە كە پەیوەندی بە زەوی و پێكهاتنی و بە زانستەكانی ترەوە هەبێت، دەتوانیت ڕاشكاوانە بڵێیت هەموو باسەكانی ناوی بە هەموو ڕێگا جیاوازەكانییەوە ڕاستەقینەن و لەم سەردەمەشدا بە هۆكارە زانستییەكان ئنجا دەتوانرێت بسەلمێنرێن. تا ڕادەیەك

دەتوانین بڵێین قورئان پەڕتووکێکی زانستی ئاسان کراوە بۆ کەسێکی ئاسایی و زۆرینەی ئەو باسانەی کە لەو کاتەدا پێشکەشی کردوون نەتوانراوە بە ئاسانی بسەلمێنرێن، بەڵام ئێستا بە هۆکارە زانستییە نوێیەکان دەتوانرێت وتەکانی 1400 ساڵ لەمەوبەری موحەممەد (ﷺ) بسەلمێنرێن".

شێخ زندانی: خوای گەورە لە پەڕتووکەکەیدا ڕاستی فەرمووە:

﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ (٨٧) وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ (٨٨)﴾ ص، واتە: "ئەم قورئانە پەند و ئامۆژگارییە بۆ هەموو جیهانیان و، بێگومان هەواڵەکانی (ڕاستییەتی)دوای ماوەیەکی تر دەزانن".



"بڕوام وایە ئەمە زۆر زۆر نهێنییە، قورسە سەرچاوەکەی
مرۆڤ بێت، بێگومان ئەگەر ئەوانەی وتت ڕاست بن باوەڕم
وایە ئەم پەڕتووکە زۆر جێگای بایەخە، ئەو کاتە قسەکانت
پەسەند دەکەم".

پرۆفیسۆر سیاڤێدا

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، دروود و سەلام لەسەر گەورەمان موحەممەد (ﷺ) و یار و شوێنکەوتووانی بە گشتی.

ئەمڕۆ بە نموونەیەکی تری زانا دەگەین، کە جیاوازە لە هەندێک زانای تر، ئەویش (پرۆفیسۆر سیاڤێدا)یە.

(پرۆفیسۆر سیاڤێدا) لە بەناوبانگترین زانا جیۆلۆجییەکانی دەریاییە لە یابان و هەروەها لە جیهانیشدا.



Professor Siaveda; Professor of Marine Geology, Japan.

(پرۆفیسۆر سیاڤێدا) سەری بە گومان بەرامبەر هەموو ئایینەکان پڕ بوو بوو. بێگومان ئەو هەقی بوو هەرچی بڵێت لەبارەی ئایینەکانی تر جگە لە ئیسلام، چونکە ئیسلام لە هەموو ئایینەکانی تر جیاوازە.

یەکەمجار کە بینیمان، پێی وتین: خاوەن ئایینەکان هەرگیز بۆیان نییە قسە بکەن و پێویستە لە هەموو دنیا بێدەنگ بن.

پێم وت: بۆچی پرۆفیسۆر؟ بۆچی؟

وتی: چونکە ئێوە هەر کە قسە بکەن جەنگ لە نێو

خەڵکی و لە هەموو جیهاندا هەڵدەگیرسێنن.

منیش پێم وت: "ئەی پەیمانی وارشۆ و پەیمانی ئەتڵەسی؟ ئەو هەموو جبەخانەی چەکە ئەتۆمییانەی لە ئاسمان و لە دەریاکان و لەسەر زەوی و لە ژێر زەویدا کۆیدەکەنەوە، بۆچییانە؟

ئایا هۆکەی ئایینییە؟ ئەویش بێدەنگ بوو"...

پێمان وت: بە هەر حاڵ ئێمە دەزانین کە تۆ هەڵوێستت لە بەرامبەر هەموو ئایینەکان وەرگرتووە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە نازانیت ئیسلام چییە، دەمانەوێت سەرەتا گوێمان لێ بگریت و بشزانین لای بەڕێزتان چی هەیە!

چەند پرسیارێکمان لە بواری پسپۆڕییەکەی و ئەو ئایەت و فەرموودانەی ئەو دیاردانە وەسف دەکەن ئاراستە کرد. لەوانە داوامان لێکرد بابەتی چیاکان ڕوون بکاتەوە، لێمان پرسی شێوەی چیاکان چۆنە؟ ئایا لە شێوەی (مێخ)دان؟

پرۆفسیۆر سیاقێدا وەڵامی دایەوە و وتی:

"چیا کیشوەرییەکان و چیا زەریاییەکان لە ماددەی گونجاو دروست دەبن. بە نموونە: چیا کیشوەرییەکان لە بنەڕەتدا لە ماددەی نیشتوو دروست دەبن، لە کاتێکدا چیا زەریاییەکان لە بەردە گڕکانییەکان دروست دەبن. چیا کیشوەرییەکان لە ئەنجامی هێزی پەستاوتنەوە دروست

دەبن، بەڵام چیا زەریاییەکان لە ئەنجامی هێزی کشانەوە دروست دەبن. لەگەڵ ئەوەشدا خاڵی هاوبەشی هەردوو جۆرە چیاکە ئەوەیە: کە ڕەگیان هەیە بۆ ڕاگرتنیان.

بۆ نموونە: لە حاڵەتی چیای کیشوەریدا ماددەی سوک و چڕیی کەم چیاکەی پێکهێناوە و بە ناخی زەویدا وەک ڕەگ دەچێتە خوارەوە، هەروەها لە حاڵەتی چیا زەریاییەکانیشدا ماددەیەکی سووک وەک ڕەگ چیاکان ڕادەگرێت، ئەوەندە هەیە لە باری چیا زەریاییەکاندا ماددە سوکەکە بۆ پێکهاتەی سوک گونجاوە، بەڵام گەرمە، لەبەرئەوە بە شێوەیەکی تەنک درێژ بووەتەوە، بەڵام لە ڕووی چڕییەوە هەمان ئەرک جێ بەجێ دەکەن کە ڕاگرتنی چیاکانە. لەبەرئەوە ئەرکی ڕەگەکان ڕاگرتنی چیاکانە بە پێی یاسای سەرئاوکەوتنی تەنەکان لای (ئەرخەمیدس)".

(پرۆفیسۆر سیاڤێدا) شێوەی هەموو چیاکانی بۆ لێکداینەوە، ئەگەر لە وشکانی کیشوەرەکان بێت، یان لە بنی زەریاکاندا بێت، دەبینین لە شێوەی مێخدان. بەڵام ئایا کەسێک هەبووە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ئەم شێوەیەی زانی بێت؟

ئایا مرۆڤ خەیاڵی بۆ ئەوە دەچێت ئەو بارستە گەورانە لە چیاکان بە ناخی زەویدا درێژبوونەوەیان هەبێت، کە زاناکان بە ڕەگ ناوی دەبەن؟ زۆربەی پەرتووکەکان کە باسی جوگرافیا دەکەن و لەو بارەدا پسپۆڕ نین تەنها بەشی سەرەوەی چیاکان نەبێت وەسفی ناکەن. بەڵام ئەمە

زانست دەریخستووە و، پەروەردگاریش لە وەسفی چیاکاندا دەفەرموێت: ﴿وَالْجِبَالَ أَوْتَاداً (٧)﴾ النبـاء .

کاتێک پرسیارمان لە پرۆفیسۆر سیاڤێدا کرد ئایا چیاکان هیچ دەورێکیان هەیە لە جێگیر کردنی توێکڵی زەوی؟

وتی: تا ئێستا زانست ئەمەی دەرنەخستووە .

ئێمە پرسیارمان دەکرد و دەگەڕاین، بەڵام زۆرینەی زانا جیۆلۆجییەکان هەمان وەڵامیان دەدایەوە، تەنها کەمێکیان نەبێت. یەکێک لەوانە خاوەنی پەرتووکێکە بە ناوی (زەوی). ئەم پەرتووکە سەرچاوەیەکی زانستییە لە زۆربەی زانکۆکانی جیهاندا.

یەکێک لە نوسەرەکانی (فرانک پێرس)ە، کە ئێستا سەرۆکی ئەکادیمیای زانستەکانە لە ئەمەریکا. پێشتر ڕاوێژکاری زانستیی سەرۆکی پێشووی ئەمەریکی (کارتەر) بووە. ئەم نووسەرە چی دەڵێت؟ وەک دەبینین لە لاپەڕە (488)دا، شێوەی چیا ڕوون دەکاتەوە کە وەک (مێخ) وایە، هەروەها لە لاپەڕە (413)، وەک لەم وێنەیەدا دیارە بەشە دیارەکەی چیا بچووکە، بەڵام ڕەگی هەیە و لە چینی ژێرەوەدا بەرەو خوار ڕۆچووە .

وێنەیەک شێوەی چیا ڕوون دەکاتەوە ئەو بەشەی دیارە لەسەر زەوی کەمترە لەو بەشەی تری کە چووەتە ناو زەوییەوە و بە تەواوی وەکو مێخ وایە.




لەم شێوەیەدا لە لاپەڕە (435)دا دەبینین لە بارەی ئەرکی چیاکانەوە نووسیویەتی و، دەڵێت:

چیاکان دەورێکی گەورەیان هەیە لە جێگیرکردنی توێکڵی زەوی.

ئەوەش ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز (1400) ساڵە باسی کردووە و دەفەرموێت:

﴿وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا (٣٢)﴾ النازعات.

واتە: "شاخەکانیشی بە تۆکمەیی دامەزراندووە".

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَالْجِبَالَ أَوْتَاداً (٧)﴾ النباء.

واتە: " (ئایا) چیاکانمان وەک مێخ بۆ دانەکوتاون؟" .

هەروەها دەفەرموێت:

﴿وَأَلْقَى فِي الأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِكُمْ (١٥)﴾ النحل.

واتە: "هەر خوا لەسەر ڕووی زەوی چیاکانی چەسپاندووە تا جێگیربن و نەکەون" .

ئایا کێ هەواڵی ئەمەی دا بە موحەممەد (ﷺ)؟

پاشان پرسیارێکمان ئاراستەی (پرۆفیسۆر سیاڤێدا) کرد و پێمان وت:

ڕای تۆ بەرامبەر ئەمەی بینیت لە بارەی باس کردنی قورئان و سوننەت بۆ نهێنییەکانی گەردوون، چییە؟ کە لەم سەردەمەدا نەبێت زانست دەری نەخست؟

بەم وتانە وەڵامی داینەوە:

"بڕوام وایە ئەمە زۆر زۆر نهێنییە، ناکرێت سەرچاوەکەی مرۆڤ بێت. بێگومان ئەگەر ئەوانەی وتت ڕاست بن باوەڕم وایە ئەم پەڕتووکە زۆر جێگای بایەخە و، ئەو کاتەش قسەکانت پەسەند دەکەم" .

شێخ زندانی: زاناکان دەتوانن چی بڵێن؟ بێگومان ناتوانن ئەو زانستەی لەم پەڕتووکەدا خودا بۆ موحەممەد (ﷺ)-ی دابەزاندووە، بیدەنە پاڵ سەرچاوەی مرۆیی یان پاڵی بدەنە لایەنێکی زانستی لەو سەردەمەدا، چونکە گشت زاناکان هیچ شتێکیان دەربارەی ئەو نهێنییانە نەزانیوە.

بێگومان مرۆڤایەتی هیچی دەربارەی ئەو نهێنییانە نەزانیوە و هیچ لێکدانەوەیەکیان بۆ ئەوە نەبووە، تەنیا ئەوە نەبێت وتویانە ئەمە لە شوێنێکی ترەوەیە لە پشتی گەردوونەوە. بەڵێ بێگومان ئەمە وەحی پەروەردگارە، کە نیگای کردووە بۆ پێغەمبەرە نەخوێندەوارەکەی موحەممەد (ﷺ) و، کردوویەتی بە موعجیزەیەکی هەمیشەیی و بەردەوام، کە هەتا ڕۆژی دوایی لەگەڵ مرۆڤایەتیدا بەردەوام دەبێت.

﴿لَكِنْ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ ...(١٦٦)﴾ النساء.

﴿وَقُلْ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا... (٩٣)﴾ النمل.



"ئەگەر پێشتر تۆمارێک نەبوبێت وەک ئەوەی لە قورئاندا هەیە، ئەوا ئەو بیروباوەڕە بەهێز دەبێت کە خودا لە ڕێگەی موحەممەد (ﷺ) ئەندازەیەکی کەمی ناردووە کە ئێستا ئێمە بۆمان دەسەلمێت. ئێمە بە ئومێدین لە وتووێژێکی بەردەوامدا بین سەبارەت بە زانستی قورئانی لەگەڵ زەویناسیدا".

پرۆفیسۆر پالمار

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان درووود و سەلام لەسەر گەورەمان پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵ و شوێنکەوتووانی بە گشتی.

چۆن بەڵگە بەم ئایینە دروست دەکەین، بۆ ئەوانەی بە زمانی عەرەبی قسە ناکەن و ئیعجازی ڕەوانبێژی لەم سەردەمەدا نازانن؟

ئایا لەسەریان پێویستە فێری زمانی عەرەبی ببن و لە زانستەکانی باش شارەزا بن؟

یان پەروەردگار میهری لەگەڵ ئەوان و هەموو نەوەکان کردووە و، بە پێی جیاوازی ڕەگەز و زمان و کات و سەردەمەکان، هێندە بەڵگەی داناوە کە بەشی هەموو مرۆڤایەتی بکات بۆ هەتا هەتایە.

لـەم گفتوگۆیـەدا پرۆفیسـۆر (پالمار)مـان لەگەڵدایـە، لـە ناودارترینـی زاناکانـی جیۆلۆجیایـە لـە وڵاتـە یەکگرتووەکانـی ئەمەریـکا، سـەرۆکی لیژنـەی ئاهەنگی سـەد ساڵەی کۆمەڵـەی جیۆلۆجییەکانـی ئەمەریـکا بـوو.




کاتێـک پێـی گەشـتین و ڕووەکانـی ئیعجـازی زانسـتی قورئـان و سـوننەتمان پیشـان دا، سەرسـوڕمان گرتـی..!

چیرۆکێکـی خـۆش بـاس دەکـەم کـە سـەرەتای دەسـت پێکـردن بـوو لەگەڵیـدا، ئێمـە پێمـان وت: "قورئـان باسـی نزمتریـن ناوچـەی سـەر زەوی کـردووە و دەسـت نیشـانی کـردووە کـە نزیکی شـاری (قـودس)ە، کـە لەویـادا جەنگێـک لـە نێـوان فـارس و ڕۆمەکانـدا ڕووی داوە، وەک پـەروەردگار ئامـاژەی پـێ کـردووە و دەفەرموێـت:

﴿الم (١) غُلِبَتْ الرُّومُ (٢) فِي أَدْنَى الأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣)﴾ الروم.

واتە: "ئەلیف لام میم، ڕۆمەکان تێکشکێنران، لە نزمترین شوێنی زەویدا بەڵام دوای ئەم شکانەیان سەردەکەونەوە."

وشەی (أَدنی) بە واتای (نزیکترین) و بە واتای (نزمترین) دێت.

تەفسیر زاناکان (خوا لێیان ڕازی بێت) بۆ واتای نزیکترین چوون بەوەی نزیکترین شوێنە لە دورگەی عەرەبەوە، بەڵام واتای دووەمیش مەبەستە، چونکە قورئانی پیرۆز بەو جۆرەیە، تەنیا وشەیەک چەند واتایەک دەبەخشێت."

کاتێک ئەم باسەمان لای (پرۆفیسۆر پالمار) کرد، وتی: نەخێر... چەندین ناوچەی تر هەن لەو ناوچەیە نزمترن، ئیتر نموونەی چەند ناوچەیەکی تری لە ئەوروپا و ئەمەریکا هێنایەوە.



ئێمـــەش پێمـــان وت: دکتـــۆر ئێمـــە دڵنیـــا بوویـــن لـــەوە. لەوێدا وێنەیەکی بەرجەستەی جوگرافی لا بوو کە بەرزی و نزمییەکانی لەسەر دیاری کرابوو، وتی: کارەکە ئاسان بوو، ئەوە نەخشەیەکی بەرجەستەیە و نزمترین شوێنی تێدا دیاری کراوە. گۆی زەویەکەی بە دەست خولاندەوە تا چاوی کەوتە سەر ناوچەیەکی نزیک لە بەیتول مەقدیس، تیرێک ڕاکێشرابوو لەسەری نوسرابوو نزمترین شوێن لە سەر ڕووی زەوی، پاشان بەخێراییەک ئاوڕی دایەوە و، وتی: ئەوەی وتت ڕاست دەرچوو، پاشان لەسەر نەخشەکە باسی ئەو شوێنەی لای دەریاچەی تەبەرییە دەکرد و، وتی: ئەمە نزمترین شوێنی ڕووی جیهانە.



پرۆفیسـۆر پالمـار: "لـە ڕاسـتیدا ئـەم نەخشـەیە پێمـان دەڵێـت نزمترین شـوێن لـە ڕووی جیهانـدا تەنیشـتی دەریـای مـردووە".




شـێخ زندانـی: "کاتێـک (پرۆفیسـۆر پالمـار) بینـی قورئـان وەسـفی ڕابـردوو دەکات چـۆن دەسـتی پـێ کـردووە و دروسـتبوونی زەوی چـۆن دەسـتی پـێ کـردووە، ئاسـمان چۆن بـووە و، دەریاکان چۆن لـە ناو سکی زەوی دەرهاتـن، چیـاکان چـۆن وەک لەنگـەر دروسـت بـوون و، ڕووەکـەکان چۆن دەرهاتـن و، چۆن ئـەم ڕووداوانـە ڕوویـان داوە و، چۆن وەسـفی ڕووی زەوی لـە ئێسـتادا دەکـەن و وەسـفی چیـاکان و دیاردەکانـی تـری سـەری دەکـەن، پاشـان ئـەو دۆخانـەی زەوی پیایـدا تێپـەڕ بـووە و سـەبارەت بـە دورگـەی عەرەبـی چـی ڕووی داوە، تەنانـەت وەسـفی داهاتـووی زەوی وڵاتـی عەرەبی و حاڵەتـی داهاتـووی زەویـش دەکات، کاتێـک پرۆفیسـۆر هەمـوو ئەمانـەی بینـی بـە ڕاسـتی سـەری سـوڕما".

وتی: "بە ڕاستی ئەم پەڕتووکە سەرسوڕهێنە، وەسفی ڕابردوو و وەسفی ئێستا و وەسفی داهاتووشمان بۆ دەکات"...

بەڵام هەروەک زاناکانی تر ڕاڕا بوو هەتا لە دواییدا بیروڕای خۆی ئاشکرا کرد. توێژینەوەیەکی لە قاهیرە سەبارەت بە ئیعجازی بواری زەویناسی پێشکەش کرد و کۆتایی توێژینەوەکەی بەم وتانە هێنا:

"من نازانم ئاستی ڕۆشنبیریی لە سەردەمی موحەممەد (ﷺ) چەند بووە و نازانم لە چ ئاستێکی زانستیدا بوون، ئەگەر کارەکە بەو جۆرەبێت وەک دەیزانین لەبارەی پێشینەکانەوە، ئەوا دیارە ئاستی زانستییان زۆر لاوازبووە و توانای ئەمانەیان نەبووە، بێگومان ئەمەش دەیسەلمێنێت کە ئەو زانستەی ئێستا لە قورئاندا دەیخوێنینەوە، ڕۆشنایی زانستی خواییە و بۆ موحەممەد (ﷺ) نیگا کراوە".

ئەمەش ئەوە و کۆتایی توێژینەوەکەی بەم لێدوانە هێنا:

"من هەستام بە توێژینەوەی مێژووی شارستانییەتی پێشووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تا بزانم ئایا هەواڵی گرنگی لەو جۆرە باس کراوە؟ خۆ ئەگەر پێشتر تۆمارێک نەبووبێت وەک ئەوەی لە قورئاندا هەیە، ئەوا ئەو بیروباوەڕە بەهێز دەبێت کە خودا لە ڕێگەی موحەممەد (ﷺ) ئەندازەیەکی کەمی ناردووە کە ئێستا ئێمە بۆمان دەسەلمێت. ئێمە بە ئومێدین لە وتووێژێکی بەردەوامدا بین سەبارەت بە

زانستی قورئانی لەگەڵ زەویناسیدا".

شێخ زندانی: "بەڵێ.. ئەوە یەکێکە لە گەورە زانایانی جیۆلۆجیی جیهانیی سەردەم لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. دوودڵ نییە دان بەڕاستییەکاندا بنێت و پێشکەش بکات و ڕوون بکاتەوە، تەنها ئەوەندەیە پێویستی بە یەکێکە ڕاستییەکانی بۆ ڕوون بکاتەوە. ڕۆژئاواییەکان و ڕۆژهەڵاتییەکان ماوەیەک لە جەنگی نێوان ئایین و زانستدا ژیان، دەبوایە ئەو جەنگە ڕووی بدایە، چونکە گشت ئایینەکان شێوێنراون. خوای گەورە موحەممەد (ﷺ)ی بە ئیسلام بۆ ئەوە نارد تا ئەو شێواندنانە ڕاست بکاتەوە.

لەوانەیە یەکێک بپرسێت و بڵێت:

چۆن ئەو خەڵکانە لێمان وەردەگرن لە کاتێکدا ئێمە دواکەوتووین و لە ئایینەکەی خۆشمان دوورین؟

دەڵێم: زانست چاوی شوێنکەوتووەکانی دەکاتەوە، ئەوان دەڕواننە ڕاستییەکان، نەک ڕواڵەت، سەرمایەی ئیسلام ئەمڕۆ ئەو زانست و پێشکەوتنە زانستییانەیە.

ئەوە زانایەکە سەری لە ئاست گەورەیی کتێبی خودا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) نەوی دەکات.

پاشان فیترەتی خوایی کە خودا داویەتی بە خەڵکی بە ئیمان نەبێت ئارام نابێت، مرۆڤ بە بێ ئیمان لە دوودڵی و سەرگەردانیدایە. پاشان ئەو ئازادییەی خەڵکی ڕۆژئاوا چێژی لێ وەردەگرن زاناکانیانی وا لێکردووە ئەو بیر و باوەڕەی هەیانە وەک خۆی دەری ببڕن و گوێ بە هیچ ترسێک نەدەن.

ئەوە ئەوانن هەروەک بیستمان لە زۆربەی ئەم ئەڵقانەدا دانیان نا بە موعجیزە زیندووە تازەبووەکانی قورئان کە تا ڕۆژی دوایی بەردەوامە.



"بە ڕاستی من زۆر کاریگەر بووم بەم جۆرە زانیارییانە کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون و، من ڕێگایەکم نییە بزانم لە کوێوە سەرچاوەیان گرتووە، بەڵام ئەوپەڕی جێگای سەرسامییە کە ئەم جۆرە زانیارییانە لە قورئاندا هەن".

پرۆفیسۆر ولیام دەبلیو های



ئەمە (پرۆفیسۆر های)ە. لەگەڵ ئەم پرۆفیسۆرەدا بۆ گەشتێکی دەریایی ڕۆیشتین، تا هەندێک لەو دیاردە دەریاییانەمان پیشان بدات کە پەیوەست بوون بە توێژینەوەکەمانەوە لە بواری ئیعجازی زانستیی لە قورئان و سوننەتدا.

(پرۆفیسۆر ولیام دەبلیو های) لە ناودارترین زاناکانی دەریایی ئەمەریکایە، مامۆستای جیۆلۆجییە لە (زانکۆی کۆلۆرادۆ، بۆڵدەر)، لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

William Hay; Professor of Oceanogprahy, University of Colorado, Boulder, Colorado, USA.

پرسـیارمان لـه بارەی زۆر لە دیاردە دەرياييەكانەوە لێ كرد، كـە پەیوەندییـان بـە ڕووی دەریـا و، سـنووری جیاكـەرەوەی دەریـای ڕووكەشـی و دەریـای قـوڵ (البحـر السـطحي والبحـر العميـق)، هەروەهـا ئـەو پرسـیارانەش كـە پەیوەنـدی بـە قوڵایـی و جیۆلۆجیـای دەریاكانـەوە هەبـوو. پاشـان پرسـیاری بەربەسـتی ئاویـی نێـوان دەریـا جیـاوازەكان و، بەربەسـتی ئاویـی نێـوان دەریـا و ڕووبارەكانمـان لـێ كـرد، ئەویـش بـە درێـژی وەڵامـی دەداینـەوە. كاتێـك گەیشـتینە لێكدانـەوەی بەربەسـتەكانی نێـوان دەریـا سـوێرەكان، بـۆی ڕوون كردینـەوە كـە دەریـا سـوێرەكان بـەو جـۆرە نیـن كـە ئێمـە دەیانبینیـن وەك یـەك دەریـا دەردەكـەون، بەڵكـو لـە پلـەی گەرمـی و سـوێری و چڕیـدا لـە یەكتـر جیـاوازن، وەك لـەم وێنەیـەدا دەیبینیـن.



لەم وێنەیەدا هێڵی سپی دەبینین کە بەربەستی نێوان بارستە دەرياييیەكان دەنوێنن، هەر بەربەستێک دوو بارستەی دەريايی جياواز لە گەرمی و سوێری و چڕی و زيندەوەرە ئاوييەكان و توانای توانەوەی ئۆكسجين، لە يەكتر جيا دەكاتەوە.




ئەم وێنەیە يەكەم جار بەم شێوەيەی ئێستای لە ساڵی (1942)دا زانرا، پاش ئەوەی زاناكان بۆ لێكۆڵينەوەی تايبەتمەندييەكانی دەرياكان بە سەدان وێستگەی ئاوييان لە دەرياكاندا دانا.

لێرەدا سنووری جیاکەرەوەی نێوان دەریای سپیی ناوەڕاست و زەریای ئەتڵەسی دەبینین، لە ناوەڕاستی وێنەکەدا سێگۆشەیەک هەیە کە ناوچەی (جبل طارق)ە، لەم ناوچەیەدا دەبینین چۆن سنووری جیاکەرەوە دروست بووە، کە بە ڕەنگی جیاواز لە نێوان دوو بارستە ئاوییەکەدا ڕوون کراوەتەوە، بێگومان ئەمانە شتێک نین کە بە چاوی ئاسایی ببینرێن، بەڵام ئەمڕۆ بوونەتە هەقیقەتێکی ئاشکرا، بە هۆی پێشکەوتنی لێکۆڵینەوەی مانگە دەستکردەکان و زانستی هەستکردن لە دوورەوە (الإستشعار عن بعد). ئەو مانگە دەستکردانە توانییان وێنەی ناوچە دەریاییەکان و سنووری ئاویی نێوان بارستە جیاوازەکان بگرن، وەک لەم وێنەیەدا دەیبینین کە بە هۆی مانگە دەستکردەکانەوە بە پشت بەستن بە تایبەتمەندیەتی گەرمی (الخاصية الحرارية) گیراوە، کە تیایدا دەریاکان بە ڕەنگێکی جیاواز دەرکەوتوون، هەندێکیان بە ڕەنگی شینی کاڵ، هەندێکی تریان بە ڕەنگی شینی تۆخ، هەندێکی بە ڕەنگی زەرد و هەندێکی بە ڕەنگی سەوزباو دەبینین. ئەو ڕەنگە جیاوازانە هۆکارەکەی جیاوازییە لە پلەی گەرمی ڕووی دەریاکاندا، بەڵام ئەگەر لەسەر ڕووی دەریا بووەستیت جگە لە ئاوێکی شین، هیچی تر نابینیت، ئەوانە بەربەستێکن بە لێکۆڵینەوە و تەکنیکی نوێ نەبێت نابینرێن. ڕاڤەکارانی قورئان لە ڕاڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دوو بۆچوونی جیاوازیان هەبووە، زۆرینەیان لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا:

﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ (١٩) بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لا يَبْغِيَانِ(٢٠)﴾ الرحمن.

وتویانە (مَـرَجَ) واتـا تێکەڵبـوون وەک لـە زمانەوانیدا هاتووە . (مَـرَجَ الْبَحْرَيْـنِ يَلْتَقِيَـانِ): واتـا دوو دەریـا بـە یـەک دەگـەن و تێکـەڵ دەبن. (بَيْنَهُـمَا بَـرْزَخٌ): واتـە بەربەسـتێک لـە نێوانیاندایە .

(لا يَبْغِيَـانِ) واتـا هیچیـان سەرکەشـی بـۆ سـەر ئـەوی تریـان نـاکات و سـنوور نابەزێنێـت .

لـە ڕای دووەمیانـدا وتوویانـە: چـۆن لـە نێـوان دەریاکانـدا بەربەسـت هەیـە؟ وە چـۆن وەسـفی کـردوون بـەوەی زاڵ نابـن بەسـەر یەکـدا؟ وە دەڵێن (مَـرَجَ) واتـای تێکەڵبوونـە؟ ئـەی چـۆن تێکـەڵاو دەبـن و بەربەسـت لـە نێوانیاندایـە؟ لـە کاتێکدا پـەروەردگار هەواڵـی داوە هیـچ کامیـان بەسـەر ئـەوی تریانـدا سەرکەشـی نـاکات و تایبەتمەندییەکانـی خـۆی بەسـەر ئـەوی تریانـدا زاڵ نـاکات.

لەبەرئـەوە وتیـان: کەواتـە دوو دەریاکـە تێکـەڵاو نابـن، بۆیـە بـە دوای واتایەکـی تـردا گـەڕان بـۆ وشـەی (مَرَجَ). بـەڵام زۆرینـەی موفەسـیرەکان بەرپەرچـی ئـەم بۆچوونەیـان دایـەوە بـەوەی کـە بەڵگەکەیـان درووسـت نییـە .

هەتا زانستەکان هاتن و وردەکارییەکانیان دەرخست. بەڵێ.. وەک بینیمان دەریاکان هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیاندا تێکەڵاو دەبن، ئاوی دەریای سپی دەچێتە ناو ئاوی زەریای ئەتڵەسییەوە و، بە پێچەوانەوە ئاوی زەریا دەچێتە ئاوی دەریای ناوەڕاستەوە. لە نێوانیاندا بەربەستێکی ئاویی گۆشە لار هەیە، لەم بەربەستەدا ئاوی هەریەک لە دەریاکان دەگوازرێتەوە بۆ دەریاکەی دراوسێی، بەڵام لە کاتی گواستنەوەکەدا تایبەتمەندییەکانی لە دەست دەدات و لەگەڵ دەریاکەی دراوسێی ئاوێتە دەبێت، واتە هەر کاتێک ئاوی دەریای سپی بچێتە ئاوی زەریاکەوە، سیفەتی زەریاکە وەردەگرێت، وە هەر کات ئاوی زەریاکە بچێتە دەریای سپییەوە وردە وردە لەم بەربەستەدا، سیفاتەکانی دەریای سپی وەردەگرێت، بەوەش هیچیان بەسەر ئەوی تریاندا زاڵ نابێت. (لا یبغیان).

ئێستا باش سەرنج بدە چۆن دۆزینەوەکان دێن، زانستی مرۆڤایەتی پێش دەکەوێت و ئایەتەکانی ئیعجاز ڕۆشنتر دەردەکەون.

سەبارەت بەو دیاردانە لەگەڵ پرۆفیسۆر های قسەمان کرد، لەبارەی ئەم ئایەتە و جگە لەمەش. هەتا لە کۆتایدا ئەم پرسیارەی ئاراستە کرا:

ڕات بەرامبەر ئەم دیاردەیە چیە؟

دەقانێـک لـە پێـش (1400) سـاڵدا دابەزیـون، وەسـفی وردەکارییەکانـی دروسـت بـوون و پێکهاتـن دەکـەن، کـە لـەو کاتـەدا ئەسـتەم بـووە مرۆڤایەتـی ئـەو زانیارییانـە بزانـن، تـا زانسـتی ئەمـڕۆ هـات و وردەکارییەکانـی ڕوون کـردەوە، ڕات لـە بەرامبـەر ئەمـەدا چییـە؟

پرۆفیسـۆر هـای لـە وەڵامـدا وتـی: "بـە ڕاسـتی مـن زۆر کاریگـەر بـووم بـەم جـۆرە زانیارییانـە کـە لـە قورئانـی پیـرۆزدا بوونیـان هەیـە و، مـن ڕێگایەکم نییـە بزانم لـە کوێـوە هاتـوون، بـەڵام ئەوپـەڕی جێگای سەرسامییە کـە ئـەم جـۆرە زانیارییانـە لـە قورئانـدا هـەن".

وەرگێڕەکـە: کەواتـە تـۆ بـە تـەواوی بەرپەرچـی ئـەوە دەدەیتـەوە کـە لـە سـەرچاوەیەکی مرۆییـەوە بێـت، واتـە لـە بـڕوای تـۆدا بنەڕەتێـک یـان سـەرچاوەیەک هەیـە بـۆ ئـەم زانیارییانــە؟

پرۆفیسـۆر هـای: "بـڕوام وایـە و پێویسـتە لەلایـەن خـوداوە بـن".



شێخ زندانی: بێگومان ئەمە زانستی خودابیە، کە پاڵپشتی پەیامبەرەکەی پێ کردووە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

(ما من الأنبياء من نبي إلا قد أعطي من الآيات ما مثله امن عليه البشر، وإنما كان الذي أوتيت وحيا أوحاه الله إليَّ، فأرجو أن أكون أكثرهم تابعا يوم القيامة) رواه البخاري باب كيف نزل الوحي و أول ما نزل 8954.

واتە: "هیچ پێغەمبەرێک نییە کە موعجیزەی نەدرابێتێ و خەڵکی بڕوای پێ نەهێنابێت، بەڵام ئەو موعجیزەیەی دراوە بە من ئەو نیگایەیە کە خوای گەورە بۆی ناردووم. هیوادارم بە هۆی ئەو نیگایەوە کە قورئانی پیرۆزە زۆرترین شوێنکەوتەم لە ڕۆژی زیندووبوونەوە هەبێت".

بێگومان ئەوە نیگایە و موعجیزە و بەڵگەی ڕوونی بۆ مرۆڤایەتی، تا هاتنی قیامەت تێدایە.



"بە ڕاستی گرانە وا دابنێین ئەو جۆرە زانیاریانە لە پێش (1400) ساڵەوە هەبووبن، هەندێک شت بە شێوەیەکی گشتی باسکراوە، بەڵام بەم وردەکارییە زۆر زەحمەتە هەبووبن، لەبەرئەوە گومانی تێدا نییە ئەمە زانستی سادەی مرۆڤایەتی نییە، مرۆڤێکی ئاسایی ناتوانێت بەو ئەندازە وردەکارییە دیاردەکان لێک بداتەوە، بۆیە من بیرم لە هێزێکی دەرەکی پشت سروشت و مرۆڤ کردووەتەوە، کە بێگومان ئەو زانیاریانە لە سەرچاوەیەکی ئەودیوی سروشتەوە هاتوون".

پرۆفیسۆر دورجا راو

سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیان درووود و سەلام لەسەر گەورە و پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ) تا ڕۆژی دوایی...

بێگومان قورئان موعجیزەیەکە تا ڕۆژی دوایی هەمیشە تازە دەبێتەوە و، خەڵکی لەگەڵ جیاوازبوونی ڕۆشنبیرییان و جیاوازی سەردەمەکانیان لێی تێ دەگەن. دەشتەکییەکی بیابان بەشی خۆی تێدا دەبینێت، مامۆستایەکی زانکۆش بەشی خۆی تێدا دەبینێت.

ئەمە پرۆفیسۆر (دورجا ڕاو)ە.



پرۆفیسۆری جیۆلۆجیای دەریاکانە، ئێستاش مامۆستای (زانکۆی مەلیک عەبدول عەزیز)ە لە (جیدە).

Durja Rao: Professor of Marine Geology teaching at King Abdulaziz University, Jeddah, Saudi Arabia.

پێی گەیشتین و چەند ئایەتێکمان پەیوەست بە ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەت پیشان دا.

سەری سوڕما لەوەی بیستی و لەوەی بینی، واتای ئایەتە قورئانییەکانی لە هەندێ پەڕتووکی تایبەتمەند بەو باسە دەخوێندەوە، کاتێک گەیشت بە ڕاڤەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت:

﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَنْ لَمْ يَجْعَلْ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِنْ نُورٍ (٤٠)﴾ النور.

واتە: "تاریکاییەکانی سەر دڵی بێ باوەڕان، وەک تاریکاییەکانی ناو دەریایەکی قوڵ وایە، کە شەپۆل دایپۆشیووە و لەسەرووییەوە شەپۆلی تر هەیە و لەسەروو ئەویشەوە هەور هەیە، تاریکاییەکان هەندێکی لەسەر هەندێکیەتی، ئەگەر دەستی دەربهێنێت لەوانەیە نەیبینێت، جا هەر کەس نوری ئیمانی پێ نەبەخشیبێت ئەوەی ڕووناکی بێت نییەتی".



وتـی: بەڵـێ.. زانـاکان لـە دوای ئـەوەی ژێـر دەریاییـان بەکارهێنـا و چوونـە قوڵایـی دەریـاکان ئـەو تاریکاییانەیـان بینـی، دەرکـەوت مرۆڤـ بـە بـێ ئامێـر ناتوانێـت بیسـت سـی مەتـر زیاتـر لـە ئـاودا نوقـوم بێـت.

ئەوانـەی لـە ناوچـە کەنارییەکانـی کەنـداو بـە مەبەسـتی مـرواری دەچنـە ژێـر ئـاو لـەو قوڵاییـە زیاتـر تێپـەڕ ناکـەن، ئەگـەر مرۆڤـ بۆ قوڵاییـە زۆرەکان ژێـر ئـاو بکەوێت، تاریکایـی لـە قوڵایـی (200)م دا بـەدی دەکات و، هەرگیـز بـە زیندوویـی نامێنێتـەوە، ئـەم ئایەتـە بـاس لـە دیاردەیـەک دەکات کـە تەنیـا لـە دەریـا قوڵـەکانـدا هەیـە، لەبەرئـەوە دەفەرموێـت:

﴿أو كظلمات في بحر لجي..﴾.

تاریکاییـەکان لـە دەریـای قوڵـدا نـەک هەمـوو دەریایـەک! تاریکاییەکانـی بـە کەڵەکەبوونـی هەندێکـی لەسـەر هەندێکـی وەسـف کـرد، ئـەم تاریکاییـە کەڵەکەبووانـەش بـە دوو هـۆکار دروسـت دەبـن:



10^-11 cm
10^-8 cm
10^-6 cm
0.0000038 (0.38 um)
0.0000076 cm (0.76 um)
0.1 cm
10 cm
20 cm
1 m
3m
10 m
188 m
545 m
الأشعة الكونية
أشعة جاما
أشعة إكس
الأشعة فوق البنفسجية
الأشعة المرئية
الأشعة تحت الحمراء
المايكرويف الرادار
موجات التلفزيون UHF القنوات ١٤-٨٢
موجات التلفزيون VHF القنوات ٢-١٣
موجات الراديو AM
الأشعة فوق البنفسجية
الأشعة المرئية
الأشعة تحت الحمراء
الوحدات :
$10^{-6} = \frac{1}{10^6} = \frac{1}{10,000,00}$
$1\ um = 10^{-6} m = \frac{1}{10,000,000} m$
0.30 0.40 0.50 0.60 0.70 1.00
بنفسجي
أزرق
أخضر
أصفر
برتقالي
أحمر
المنطقة تحت المنحنى تمثل نسبة ١٠٠٪
من الطاقة الشمسية على السطح
سطح البحر
نسبة الشفافية إلى أطوال الموجات ( على مقياس من ١٠ أجزاء )
1.2 2.5 5 6 7 6 5 4 1.6 1.1 1
فقط ٤٥٪ من بقايا إختراق
الضوء لسطح البحر
1 m
العمق
فقط ١٦٪ من بقايا إختراق
الضوء لسطح البحر
10 m
فقط ١٪ من بقايا إختراق
الضوء لسطح البحر
100 m

## هۆکاری یەکەم:

### لە ئەنجامی دیارنەمانی ڕەنگەکان چین لە دوای چین.

تیشـکی ڕووناکـی لـە حـەوت ڕەنـگ پێـک هاتـووە، کاتێـک تیشـکی ڕوناکـی دەچێتـە ئـاوەوە بـۆ حـەوت ڕەنگەکـە دابـەش دەبێـت، لـەم وێنەیـەی بەردەممـان تیشـکی ئاوەکـە دەبینیـن، ڕەنگـی سـوور لـە (10) مەتـری ڕووی سـەرەوە دەمزرێت، خـۆ ئەگـەر دەریاوانێـک بـۆ قوڵایـی (30) مەتـر بچێتـە ئـاوەوە و لەشـی برینـدار بێـت و خوێنـی لـێ بـڕوات و بیەوێت بیبینێت، ناتوانێـت بـە ڕەنگـی سـوور بیبینێـت، چونکـە تیشـکی سـوور نەمـاوە، لـە دوای ئـەوەش ڕەنگـی پرتەقاڵـی دەمزرێـت وەک لـە وێنەکـەدا دەیبینیـن.

لـە قوڵایـی (50 مەتـر) مژینـی ڕەنگـی زەرد دەسـت پـێ دەکات.

لە قوڵایی (100 مەتر) مژینی ڕەنگی سەوز دێت.

لە قوڵایی (200 مەتر) مژینی ڕەنگی شین دێت.

کەواتـە تاریکایـی ڕەنگـی سـەوز لـە قوڵایـی (100 مەتـر) دەبێـت و تاریکایـی زەرد لـە قوڵایـی (50 مەتـر) دەبێـت و پێـش ئـەو تاریکایـی ڕەنگـی سـوور و پرتەقاڵییـە، کەواتـە تاریکاییـەکان هەندێکیـان لەسـەر هەندێکیانـن.

## هۆکاری دووەم:

### لە ئەنجامی ئەو بەربەستانەی بەری ڕووناکی دەگرن.

تیشکی ڕووناکی کە لێرە دەیبینین لە خۆرەوە دادەبەزێت، هەور هەندێکی دەمژێت و هەندێکی پەرت دەکاتەوە، بەوەش تاریکاییەک لە ژێر هەورەکەدا دروست دەبێت، ئەم تاریکاییە کەمە، هەر کە تیشکی ڕووناکییەکە بۆ ڕووە شەپۆلداری دەریاکە دابەزی، پێچەوانە دەبێتەوە و بریسکانەوەی پێ دەدات، لەبەرئەوە لە کاتی بوونی شەپۆلدا، بە پێی لاری ڕووی شەپۆلەکە بریسکانەوەکە زیاتر دەبێت، کەواتە شەپۆل دەبێتە هۆی پێچەوانەکردنەوەی تیشک، واتە ئەمیش دەبێتە هۆی تاریکی.

پاشان تیشکی ڕوناکییەکە دادەبەزێتە خوارەوە، لێرەدا دەبینین دەریاکە بۆ دوو بەش دابەش بووە:

بەشی ڕووکەشی و بەشی قوڵ

ڕووکەشییەکە: ڕووناکی و گەرمی تێدایە.

بەڵام قوڵەکە: تاریکی و ساردی تێدایە.

هەردوو دەریاکە لە ڕووی تایبەتمەندی و سیفاتیانەوە جیاوازن، بەڵام شەپۆلێکی جیاکەرەوە لە نێوان دەریا ڕووکەشییەکە و دەریا قوڵەکەدا هەیە کە پێی دەوترێت

شـەپۆلی ناوەکـی.

ئەو شـەپۆلە ناوەکییە هەتا سـاڵی (1900 ز) نەدۆزرایەوە، لـە ژێـر ئـەو شـەپۆلە قوڵـەدا دەریایەکـی قـوڵ هەیـە و، لەوێـدا تاریکایـی دەسـت پـێ دەکات، تەنانـەت ماسـییەکانی ئـەو ناوچەیـە ناتوانـن بـە چاویـان ببینـن، بەڵکـو سـەرچاوەی تریـان هەیـە کـە لـەو تاریکییـە کەڵەکەبووانـەوە ڕوناکـی لـە لەشـیانەوە دەردەچێـت، کـە ئەمانـە خـوای گـەورە باسـی کـردووە:

﴿ أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ ...(٤٠)﴾ النور.

ئەگـەر بڕوانینـە خـوارەوەی وێنەکـە تاریکایـی دەبینیـن و لـە سـەرووییەوە شـەپۆلی یەکـەم دەبینیـن کـە دەریـا ڕووکەشـەکە و دەریـا قوڵەکـە لەیـەک جیادەکاتـەوە، پاشـان فەرمـووی: ﴿ ..يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ مَوْجٌ ...﴾ واتـە: لەسـەرو ئـەو شـەپۆلەوە شـەپۆلی تـر هەیـە کـە ئەویش شـەپۆلی سـەر ڕووی دەریاکەیـە، پاشـان فەرمـووی: ﴿ مِنْ فَوْقِهِ سَحَابٌ ﴾ واتـە: لەسـەرو ئەوەشـەوە هـەور هەیـە.

تاریکاییـەکان هەندێکیـان لەسـەر هەندێکیانـن، تاریکایـی بەربەسـتەکان و تاریکایـی ڕەنگـەکان لـە چەنـد چینێکـدا هەندێکیـان لەسـەر هەندێکیانـن. ﴿ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَنْ لَمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِنْ نُورٍ ﴾، واتـە: گـەر دەسـتی دەربهێنێـت ڕەنگـە نەیبینێـت، هـەر کـەس نـووری ئیمانـی پـێ نەبەخشـی بێـت ئـەوەی ڕووناکـی بێـت نییەتـی.

لەم ناوچانەدا تاریکایی زۆر توندە، ژێر دەریاییەکان کە بۆ ئەو قوڵاییانە دادەبەزن هیچ شتێک نابینن، لەبەرئەوە سەرچاوەی ڕووناککەرەوە بەکار دەهێنن تا بەردەمیان ببینن، ئایا کێ هەواڵی ئەم نهێنییانەی دا بە موحەممەد (ﷺ)؟

ئەمە ئەو قسە و باسانە بوو کە لەگەڵ پرۆفیسۆر (ڕاو)دا ئەنجامماندا، پاشان چەندین ئایەتی قورئانیمان پەیوەست بە دەریاکان و لە بواری پسپۆڕیەکەیدا پیشان دا.

پاشان پێمان وت: لێکدانەوەی تۆ بۆ ئەم دیاردەیە چییە؟ دیاردەی ئیعجازی زانستی لە قورئان و سوننەتدا، موحەممەد (ﷺ)چۆن توانی ئەو ڕاستییانە پێش (1400) ساڵ بزانێت؟

پرۆفیسۆر ڕاو وتی:

"بە ڕاستی ئاسان نییە وا دابنێین ئەو جۆرە زانیارییانە لە پێش (1400) ساڵەوە هەبووبن، هەندێک شت بە شێوەیەکی گشتی باس کراوە، بەڵام بەم وردەکارییە زۆر زەحمەتە هەبووبن. لەبەرئەوە بێ گومان ئەمە زانستی سادەی مرۆڤایەتی نییە، مرۆڤێکی ئاسایی ناتوانێت بەو ئەندازە وردەکارییە دیاردەکان لێک بداتەوە. بۆیە من بیرم لە هێزێکی دەرەکی پشت سروشت و مرۆڤ کردووەتەوە، کە بێگومان ئەو زانیارییانە لە سەرچاوەیەکی ئەودیووی سروشتەوە هاتوون".

شێخ زندانی: بەڵێ پێویستە سەرچاوەی ئەو زانستە لە لایەکەوە بێت لە ئاستی مرۆڤ و لە ئاستی سروشتدا نەبێت. وەک (پرۆفیسۆر ڕاو) دەڵێت: بێگومان لە پشت ئەوانەوەیە، لە سەروو سروشت و لە سەروو توانای مرۆڤایەتییەوەیە، ئەو دەیەوێت بڵێت هەرگیز ناگونجێت ئەو وتانە وتەی بوونەوەرێک بێت لە بوونەوەرەکانی سروشت. بەڵێ.. بێگومان ئەمانە وتەی یەکێکە کە بە هەموو سروشت و نهێنییەکانی ئاگادارە. ﴿قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُوراً رَحِيماً (٦)﴾ الفرقان.

واتە: "تۆ ئەی موحەممەد (ﷺ)، بڵێ: ئەو زاتەی ئەم قورئانەی دابەزاندووە بە هەموو نهێنییەک دەزانێت لە ئاسمانەکان و زەویدا، هەر ئەویش هەمیشە و بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە".

هەر بەو شێوەیەش شایەتی زاناکان یەک لە دوای یەک لە زیادبووندان. بۆ ڕوون کردنەوەی ئەوەی کە ئەم ڕێنمایی و ڕووناکییە، بەڵگەی ڕاستییەکەی لە خۆیدایە. بێگومان ئەم پەڕتووکە ڕێنماییە، بەڵگەیەکە تا ڕۆژی دوایی لە تازەبوونەوەدایە.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٥٣)﴾ فصلت.

"به ڕای من ئەوەی لەم کۆڕبەندەدا گرنگە ئەوەیە کە زاناکانی هەموو جیهان لەم شتە ئاگادار بکرێنەوە و، من زۆر دڵنیام کاتێک ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ وڵاتەکانی خۆمان زیاتر بیر لە پەیوەندی نێوان ئایین و زانستی دەریا دەکەینەوە. چونکە ئەوە ڕاست نییە کە زانست لە لایەک بێت و ئایینیش لە لاکەی تر بێت".

پرۆفیسۆر شرۆیدەر

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، درووود و سەلام لەسەر پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ) و یار و شوێنکەوتووانی بە گشتی.

"بە ڕاستی مامۆستا زندانی ئەو ڕاستییانەی پیشان دام کە هەرچی قورئان وتبێتی زانست پشتگیری دەکات و ئەوەی قورئانی پیرۆز سەدان ساڵە فەرموویەتی ڕاستەقینەیە کە زاناکانی ئەمڕۆ دەریدەخەن".

(پرۆفیسۆر شرۆیدەر)




ئەمە (پرۆفیسۆر شرۆیدەر)ە لە دەریازاناکانی (ئەڵمانیای خۆرئاوا)یە لە کۆڕبەندێکی دەریازاناکان لە زانکۆی (مەلیک عەبدول عەزیز) لە شاری (جیددە) پێی گەیشتین و داوای لێکردم وتارێک لەسەر دیاردە دەرياییەکان لە نێوان دەرخستنە زانستییەکان و ئایەتە قورئانییەکاندا پێشکەش بکەم.

پاش ئەوەی لە وتارەکەیدا لە ڕۆژی دووەمدا (پرۆفیسۆر شرۆیدەر) لەسەر وتارەکەی من لێدوانی دا، ئەمە بەشێکە لەو وتانەی پرۆفیسۆر شرۆیدەر:

خۆشحاڵم لەسەر وتارەکەی مامۆستا زندانی کە دوێنێ پێشکەشی کردین چەند قسەیەک بکەم:

"من ئەم وتارە بەرز ئەنرخێنم، لە چوارچێوەی کۆبوونەوەیەکی زانستیدا مرۆڤ مەرج نییە موسڵمان بێت،

تەنانەت سەبارەت بە من وەک مەسیحییەک گرنگە زانست نەک تەنها بەو شێوەیەی کە هەیە بیبینم بەڵکو بە شێوەیەکی فراوانتر بەراوردی بکەم بە ئایین، واتە زانست لە چوارچێوەی ئاییندا ببینم".

شێخ زندانی:

پاشان (پرۆفیسۆر شرۆیدەر) پەیوەندی نێوان ئایینەکان و زانستی ڕوون کردەوە، باسی ئەو بۆشاییە گەورەیەی کرد کە کەوتووەتە نێوان گشت ئایینەکان لەگەڵ زانستدا و، دەریخست کە دوورکەوتنەوەیەکی ئاشکرا هەیە لە نێوان ڕابەرانی زانستی ئایینی و ڕابەرانی زانستە گەردوونییەکان، بەڵام کاتێک خۆی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و ئەو ڕاستییانەی بیست کە (1400) ساڵ لەو پەڕتووکە پیرۆزەدا باس کراوە سەرسام بوو، بۆیە لەسەر ئەوە وتی:

"لە زۆرێک لە ئایینەکاندا ڕابەرانیان وا گومان دەبەن کە زانست دەتوانێت شت لە ئایین وەربگرێت، بەڵام هەر کە زانست پێش دەکەوێت ئەوە دەبێت ئایین بچێتە دواوە، بەڵام لێرەدا باسەکە بە تەواوی پێچەوانەیە، بە ڕاستی مامۆستا زندانی ئەو ڕاستییانەی پیشان دام کە هەرچی قورئان وتبێتی زانست پشتگیری دەکات و ئەوەی قورئانی پیرۆز سەدان ساڵە فەرموویەتی ڕاستەقینەیەکە زاناکانی ئەمڕۆ خەریکن دەریدەخەن.

بە ڕای من ئەوەی لەم کۆڕبەندەدا گرنگە ئەوەیە کە زاناکانی هەموو جیهان لەم بابەتە ئاگادار بکرێنەوە . من زۆر دڵنیام کاتێک ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ وڵاتەکانی خۆمان زیاتر بیر لە پەیوەندی نێوان ئایین و زانستی دەریا دەکەینەوە، چونکە ئەوە ڕاست نییە کە زانست لە لایەک بێت و ئایینیش لە لاکەی تر بێت" .

شێخ زندانی:

"بەمانەدا ڕوون بووەوە کە ئەوەی زاناکانی ئەمڕۆ دەری دەخەن (1400) ساڵە لە قورئاندا باسکراوە، بۆیە لێرەدا بۆمان هەیە بپرسین کێ ئەم زانیارانەی بە موحەممەد (ﷺ) دا، کێ نیگای بەمانە بۆ کرد، بێگومان ئەمە ئەو بەڵگە ئاشکرایەیە کە قورئانی پیرۆز یان فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) باسی کردووە و زاناکانی ئەم سەردەمەمان لە بوارە جیاجیاکانی گەردوون و دەریا و جیۆلۆجی و بەشەکانی تردا لێی تێ دەگەن" .

پرۆفیسۆر پاش ئەوەی ئەو شتانەی بیست بە هەموو متمانەیەکەوە لەم بارەیەوە دوا و، وتی:

"خەڵکانێک نییە قسە لەگەڵ یەکتر نەکەن، زانست لە لایەک نییە و ئایین لە لاکەی تر. بەڵکو هەردووکیان لە یەک ئاراستەدا دەڕۆن، ئەوان هەمان شت بە زمانێکی جیاواز دەڵێن، بە زمانێکی زۆر زانستی و بە زمانی ئایەتەکانی قورئان هەر وەک شێخ ئاماژەی پێ کرد" .

شێخ زندانی:

ئـەو زۆر بـە ڕوونـی و بـە ئاشـكرایی داوا دەكات كـە ئـەم ڕاستییانە بـە هەمـوو جیهـان و هەمـوو خەڵـك بـە گشـتی و زانـاكان بـە تایبەتـی لـە كـۆڕ و كۆبوونـەوە زانسـتییەكاندا بـە هەمـوو زمانـەكان پێشـكەش بكرێـت، تـا لـەم دیاردەیـە تێبگـەن و پەیوەنـدی ڕاسـتەقینەی نێـوان ئاییـن و زانسـت ڕوون ببێتـەوە.

بەڵـێ، بێگومـان ئـەو ئاینـەی لـە دەسـتكاری پارێـزراو بوبێـت و، ئـەو زانسـتەی ڕاسـت بێـت پێویسـتە ببنـە یـەك دەنـگ و، پێویسـتە ئایینـی ڕاسـتەقینەش هانـی زانسـتی ڕاسـتەقینە بـدات. هـەر وەك لـە ئیسـلامدا ئـەوە فەرمانـە.

﴿هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ(٩)﴾ الزمر.

واتـە: "ئایـا ئەوانـەی دەزانـن یەكسـانن لەگـەڵ ئەوانـەی كـە نازانـن؟".

﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ.... (١٩)﴾ محمد.

واتـە: "چـاك بزانـن كـە هیـچ خوایەكـی تـری بـە هـەق نییـە كـە شایسـتەی پەرسـتن بێـت جگـە لـە زاتـی (اللـە)".

﴿قُلْ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ (١٠١)﴾ یونس.

واتـە: "بڵـێ: سـەرنج بـدەن چـی لـە ئاسـمانەكان و زەویدایـە".

﴿حـم (١) تَنزِيـلُ الْكِتَـابِ مِـنْ اللَّـهِ الْعَزِيـزِ الْحَكِيـمِ (٢) إِنَّ فِي السَّـمَوَاتِ وَالأَرْضِ لآيَـاتٍ لِلْمُؤْمِنِيـنَ (٣) وَفِي خَلْقِكُـمْ وَمَـا يَبُـثُّ مِـنْ دَابَّـةٍ آيَـاتٌ لِقَـوْمٍ يُوقِنُـونَ (٤) وَاخْتِـلافِ اللَّيْـلِ وَالنَّهَـارِ وَمَـا أَنـزَلَ اللَّـهُ مِـنْ السَّـمَاءِ مِـنْ رِزْقٍ فَأَحْيَـا بِـهِ الأَرْضَ بَعْـدَ مَوْتِهَـا وَتَصْرِيـفِ الرِّيَـاحِ آيَـاتٌ لِقَـوْمٍ يَعْقِلُـونَ (٥) تِلْـكَ آيَـاتُ اللَّـهِ نَتْلُوهَـا عَلَيْـكَ بِالْحَـقِّ فَبِأَيِّ حَدِيـثٍ بَعْـدَ اللَّـهِ وَآيَاتِـهِ يُؤْمِنُـونَ (٦)﴾ الجاثيـة.

واتـە: "حـا میـم. ئـەم قورئانـە لەلایـەن خـوای باڵادەسـت و داناوە هاتووەتـە خـوارەوە. بێگومـان لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا چەندیـن بەڵگـە هەیـە بـۆ بـاوەڕداران و، لـە دروسـت کردنـی خۆتانـدا و ئـەو گیانلەبەرانـەی بڵاو دەبنـەوە، چەندیـن بەڵگـە هەیـە بـۆ کەسـێک بـاوەڕی پتەویـان هەبێـت و، لـە جیـاوازی شـەو و ڕۆژ و لـەو بارانـەی خـوا لـە ئاسـمانەوە دەیبارێنێـت کـە بـە هۆیـەوە زەوی زینـدوو دەکاتـەوە و لـە گۆڕانـی بایـەکان چەندیـن بەڵگـە هەیـە بـۆ کەسـانێک کـە تێدەگـەن. ئا ئەمانـە بەڵگەکانـی خـودان دەیخوێنینـەوە بـۆت بە ڕاسـتی و دروسـتی، جـا بـە چـی قسـە و گوفتارێـک دوای خـوا و بەڵگەکانـی بـاوەڕ دەهێنـن".

ئاییـن هانـی فێربوونـی زانسـت دەدات و فەرمانمـان پـێ دەکات سـەرنجی گەردوونـی دەوروبەرمـان بدەیـن زانسـتیش سـەری بـۆ گەورەیـی ئاییـنی هـەق نـەوی دەکات. بـەو جـۆرە بـە یارمەتـی خـوای گـەورە ئێمـە لـە سـەردەمێکی تازەدایـن، سـەردەمی بـە یەکگەیشـتنی ئاییـن و زانسـت، تـا موعجیـزەکان دەرکـەون و ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ بـە زمانێـک تـازە ببێتـەوە کـە هەمـوو خەڵکـی ئـەم سـەردەمە لێـی تـێ بگـەن.

"به ڕاستی من زۆر کاریگەرم بەو نووسراوە کۆنانە، چۆن لەگەڵ زانستی نوێی فەلەکیدا، بە شێوازێکی سەرنجڕاکێش یەکدەنگ و هاوشانە، لەوانەیە شتێک لە پشت تێگەیشتنمانەوە هەبێت وەک شارەزایەکی سادە بۆ ڕاڤەکردنی ئەو نووسراوانەی بینیمان".

پرۆفیسۆر ئارمسترۆنگ

بێگومـان پـەروەردگار بـۆی ڕوون کردوینەتـەوە کـە قورئانـی پیـرۆزی بـە ڕەحمـەت بـۆ جیهانیان نـاردووە، وەک دەفەرموێت:

﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ (٨٧) وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ (٨٨)﴾ ص.

واتـە: "قورئـان تەنهـا پەنـد و ئامۆژگارییـە بـۆ جیهانیـان. بێگومـان پـاش ماوەیـەک هەواڵـی ڕاسـتیی قورئـان دەزانـن".

قورئـان یادخـەرەوەی مرۆڤـەکانە تـا ڕۆژی دوایـی و هەواڵـی وای تێدایـە لەگـەڵ تێپەڕبوونـی کاتـدا تـازە دەبنـەوە، چونکـە قورئانـی پیـرۆز بـە زانسـتی خـودا دابەزیـوە، هەمـوو ئایەتێکـی بـە زانسـتی خـودا دابەزیـوە، وەک دەفەرموێـت:

﴿لَكِنْ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلائِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيداً (١٦٦)﴾ النساء.

واتـە: "بـەڵام خـودا شـایەتی ڕاسـتیی پێغەمبەرایەتـی

تــۆ دەدات بــەوەی قورئانــی بــۆ دابەزاندوویــت و بــە زانســتی خودایــی خــۆی بــۆی دابەزاندوویــت، فریشــتەکانیش شــایەتی دەدەن و، خــوداش بەســە شــایەت بێــت".

هەمـوو ئایەتێک زانسـتی خودایی لەخـۆ گرتووە، مرۆڤایەتیش هەتـا دێـت زیاتـر پێـش دەکەوێـت، ئەگـەر مرۆڤایەتـی گەیشـتە ئاسـتێکی وا، ئـەوا لـەو کاتـەدا دەتوانـن ئـەو واتـا خوداییـەی ئایەتەکـەی پـێ دابەزیـوە بیزانـن. ئـەو کات دەزانـن ئـەو ئایەتە لەلایـەن خــواوە نێــردراوە، بــەم شــێوەیە هــەر چەنــد زیاتــر پێـش بکـەون بـە ئایەتـی زیاتـر و زیاتـر دەگـەن، بـەو جـۆرە بــەردەوام مرۆڤــ بەڵگەیــان دەســتدەکەوێت، بــەوەی قورئانــی پیـرۆز لەلایـەن خـوای پەروەردگارەوەیـە.





Professor Armstrong works for NASA and is also Professor of Astronomy, University of Kansas, Lawrence, Kansas, USA.

ئەمە پرۆفیسۆر (ئارمسترۆنگ)ە یەکێکە لە زانا ناودارەکانی ئەمریکا لە بواری فەلەکیدا، لە وەکالەتی ناسا کار دەکات، مامۆستای زانستی فەلەکییە لە ویلایەتی کانساس.

بەم زانایە گەیشتین و پرسیاری چەند ئایەتێکی گەردوونیمان لێ کرد کە تایبەت بوو بە بواری پسپۆڕییەکەی.

پرسیاری ئاسنمان لێکرد چۆن دروست بووە؟ وتی: "من باسی هەموو توخمەکانی سەرزەویتان بۆ دەکەم چۆن دروست بوون، تەنانەت خۆم چەندین تاقیکردنەوەم بۆ سەلماندنی وتەکانم ئەنجام داوە.

بێگومــان توخمــە جیــاوازەکان بــۆ ئــەوەی تەنۆلکــەی جیاوازەکانــی وەک ئەلکتــرۆن و پرۆتــۆن و جگــە لــەوان، تیــا کۆببنــەوە و یەکبگرن، پێویستــی بــە وزە هەیــە، بــەڵام کاتێک وزەی پێویســتی پێکهاتنــی گەردیلەیەکــی ئاســنمان هەژمــار کــرد، بینیمــان وزەی پێویســت دەبێت چوار ئەوەنــدەی وزەی کۆمەڵــەی خــۆر بێــت، بــە تەنیــا نــە وزەی زەوی، نــە وزەی خــۆر، نــە وزەی مانــگ، نــە وزەی عەتــارد، نــە هــی زوحــەل، نــە هــی موشــتەری هەمــوو ئەوانــە کــە کۆمەڵــەی خــۆرن، بەشــی پێکهاتنــی گەردیلەیەکــی ئاســن ناکــەن، بەڵکو پێویستمان بــە وزەیەکــە وەک وزەی کۆمەڵــەی خــۆر و چــوار ئەوەنــدە".

پاشان بە بێ ئەوەی ئێمە هیچ بڵێین، خۆی وتی:

"بەڵــێ لەبەرئــەوە زانــاکان بڕوایــان وایــە ئاســن توخمێکــی نامۆیە و نێردراوە بۆســەر زەوی و لە خۆیدا دروست نەبووە!".



ئێمەش ئەم وتەیەی خوای گەورەمان خوێندەوە:

﴿وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ ...(٢٥)﴾ الحديد.

واتــە: "ئاسـنمان دابەزانـد کـە هێـز و سـەختی هەیـە و سـوودی بـۆ خەڵکـی تێدایـە".

پاشـان لێمـان پرسـی ئایـا لـەم ئاسـمانەدا درز و کەلێـن هەیـە؟

وتـی: "نەخێـر، ئێـوە بـاس لـە لقێـک لـە لقەکانـی زانسـتی گەردوونناسـی دەکـەن کـە نـاوی گەردوونـی تەواوە (الکـون التـام)، ئـەم گەردوونـە تـەواوەش لـەم دواییـەدا نەبێـت زانـاکان نەیـان دەزانـی، ئەگـەر خاڵێـک لـە گـەردوون وەربگیرێـت و بـە دوورییەکـی دیاریکـراو بـە ئاراسـتەیەکدا بڕۆیـت و بـە هەمـان دووری بـە ئاراسـتەیەکی تـردا بڕۆیت دەبینیـت کێشـی بارسـتەکە لـە هەمـوو ئاراسـتەکاندا یەکسـانە، چونکـە ئـەو خاڵـە هاوسـەنگە بۆیـە لـە هەمـوو لاکانـەوە پەسـتان لە سـەری یەکسـان دەبێـت. بارسـتەش پێویسـتە هـەر بـەو جـۆرە بێـت، خـۆ ئەگـەر ئـەو هاوسـەنگییە نەبوایـە ئـەوا گـەردوون دەجوڵا و کەلێـن و شـەق دروسـت دەبـوو".

شێخ زندانی: لێرەدا منیش ئەم ئایەتە قورئانییەم باس کرد: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ (٦)﴾ ق.

واتە: "ئایا سەرنجی ئەو ئاسمانەیان نەداوە کە لە سەریانەوەیە، چۆن دروستمان کردووە و ڕازاندوومانەتەوە و هیچ درز و کەلێنێکی تێدا نییە".

هەروەها باسی هەوڵی زانایانمان کرد بۆ گەیشتنیان بە کەنارەکانی گەردوون.

ئایا گەیشتونەتە کەناری گەردوون؟

وتی: "تا ئێستا لە جەنگداین بۆ گەیشتن بە کەناری گەردوون.

ئێمە ئامێرەکانمان بەردەوام گەورەتر دەکەین پاشان لێیانەوە دەڕوانین بەڵام هەر ئەستێرە دەدۆزینەوە، تا ئێستا لە ناو ئەو ئەستێرانەداین و نەگەیشتووینەتە کەنار".

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُوماً لِلشَّيَاطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ (٥)﴾ الملک.

واتە: "بێگومان ئاسمانی دنیامان ڕازاندووەتەوە بە چرای زۆری ئەستێرە و گێڕاومانن بە ڕەجمی شەیتانەکان و، سزایەکی سوتێنەرمان بۆ ئامادە کردوون".

لـەم وتـەی پـەروەرگارەوە دەزانـم، هەمـوو ئـەم ئەسـتێرانە بـۆ ڕازاندنـەوەی ئاسـمانی دونیایـە. ئەویـش دەڵێـت:

"نەگەیشتوینەتە کەنار... نەگەیشتووینەتە کۆتایی..."

وتـی: "لەبەرئـەوە بیـر لـە دانانـی تەلەسـکۆب دەکەینـەوە لـە ئاسـمان، هەتـا ئـەو تەپوتـۆز و کێشـانەی بـە هـۆی کـەش و هـەواوە لەسـەر زەوی هـەن، نەبنـە بەربەسـتی بینینمـان.

ئـەو تەلەسـکۆبانەی تیشـک بەکاردێنـن یـان چـاوی تێـدا بەکاردێـت نەیانتوانیـوە بگەنـە دوورییـە زۆرەکان، بۆیـە لـە جیاتـی ئـەو تەلەسکۆبانە، (تەلەسـکۆبی بـێ تـەل) بەکاردەهێنیـن. بـەوەش گەشـتووینەتە مـاوەی دوورتـر، بـەڵام تـا ئێسـتا لـە سـنوورەکەداین".

منیش ئەم وتەیەی پەروەدگارم باس کرد:

﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعْ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ (٣) ثُمَّ ارْجِعْ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئاً وَهُوَ حَسِيرٌ (٤)﴾ الملك.

واتـە: "ئـەو خودایـەی کـە حـەوت ئاسـمانی چیـن چینـی دروسـت کـردووە، هیـچ ناتەواویـەک لـە دروسـت کراوەکانـی خـوادا نابینیـت. چـاو بگێـڕەوە پێیـدا، ئایـا هیـچ زیادەڕەویەکت بینـی؟ دووبـارە چـاوی پێـدا بگێـڕەوە، بـە نائومێـدی چـاوت بـۆ لای خـۆت دەگەڕێتـەوە و، چـاوت دامـاو و مانـدوو بـووە".

لەگەڵ باسکردنی هەر ڕاستییەکی زانستی، ئێمەش ئایەتێکمان باس دەکرد، ئەویش پشتگیری خۆی بۆ دەردەبڕی.

پاشان پێمان گوت: تۆ بە چاوی خۆت پاش ئەوەی مرۆڤ ئامێر و موشەک و کەشتی ئاسمانی بەکارهێنا و زانیارییەکانیان دەرخست، ڕاستییە زانستییە نوێیە فەلەکی یەکانت بینی، پاشان بە چاوی خۆت دەقە قورئانییەکانی پێش (1400) لەمەوبەرت بینی کە چۆن هاوشانی زانستەکەیە، ڕای تۆ لەم بارەیەوە چییە؟

وەڵامی دایەوە: "ئەمە پرسیارێکی قورسە، لەو کاتەوەی ئێمە لێرە وتووێژ دەکەین، بیر لەوە دەکەمەوە، بە ڕاستی من زۆر کاریگەرم بەو نوسراوە کۆنانە چۆن لەگەڵ زانستی نوێی فەلەکییدا، بە شێوازێکی سەرنجڕاکێش یەک دەنگ و هاوشانە، من زانای مێژووی مرۆڤایەتی نیم کە پشتم پێ ببەسترێت لە مێژوودا، واتا بتوانم خۆم بخەمە ئەو سەردەمە کۆنەی پێش (1400) ساڵ لەمەوبەر. بەڵام نامەوێت لەوە زیاتر بڵێم کە بە دڵنیاییەوە ئەوانەی کە من بینیم زۆر جێگای سەرنج و تێبینین. لەگەڵ ئەوەی بوارێک ناهێڵێتەوە بۆ لێکدانەوەی زانستی. لەوانەیە شتێک لە پشت تێگەیشتنمانەوە هەبێت وەک شارەزایەکی سادە بۆ ڕاڤەکردنی ئەو نووسراوانەی بینیمان، بەڵام من لە نیەتمدا نییە وەڵامی ئەم خاڵە بدەمەوە. پێم وایە وشەی زۆرم گوت بە بێ ئەوەی باس لەوە بکەم کە تۆ دەتەوێت. چونکە من وەک زانایەک لەسەرمە بێ لایەن بم لە هەندێ

بابەتـی تایبـەت، لـەو بڕوایەشـدام بـۆ ئێـوە لـە باشـترین خاڵـدا وەسـتام کـە کەمێـک کەمتـرە لـەوەی ئـەو وەڵامـەت بدەمـەوە کـە تـۆ دەتویسـت".

شـێخ زندانـی: بەڵـێ، کارێکـی قورسـە پێشـبینی بـکات ئـەو زانسـتەی کـە (1400) سـاڵە لـە پەڕتووکـی پـەروەردگاردا هاتـووە، لـە سـەرچاوەیەکی مرۆییـەوە بـۆ موحەممـەد (ﷺ) هاتبێـت، بێگومـان دەبێـت سـەرچاوەیەکی دیکـە لـە پشـت بیرکردنـەوەی ئـەو زانایانـەوە هەبێـت:

﴿قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُوراً رَحِيماً (٦)﴾ الفرقان.

واتـە: "بڵـێ: قورئـان ئـەو زاتـە دایبەزانـدووە کـە ئـاگاداری نهێنییەکانـی ئاسـمان و زەوییـە. هـەر خـۆی لێخۆشـبوو و بـە بەزەییـە".

هـەروەک بینیمـان لـە چاوپێکەوتنـە جیاوازەکانـی ئـەو زانایانـەوە ئێمـە لـە بـەردەم سـەردەمێکی نوێدایـن، سـەردەمی دەسـت لـە نـاو دەسـتنانی ئاییـن و زانسـت.

زانسـتی سـەلمێنراو و ئاییـنی ڕاسـتەقینە، هەرگیـز ناگونجێت دژایەتـی و پێکـدادان لـە نێوانیانـدا هەبێـت، هـەروەک زانـا موسـڵمانەکان بـە درێژایـی سـەدەکان دانیـان بەمـەدا نـاوە و، هەرگیـز ناگونجێـت ڕاسـتییەکی زانسـتی یەکلاکـەرەوە لەگـەڵ ڕاسـتییەکی شـەرعی چەسـپاو لـە واتـا و لـە گەیاندنـی پێچەوانـە و دژ بـن، گـەر ئـەوان دەڵێـن ئێسـتا ئێمـە لـە

سەردەمی فەزا و لە سەردەمی گەردیلەداین، ئەوا ئێمەش دەڵێین: ئەو قسەیە ڕاستە، بەڵام سەردەمێکی لەوە گرنگتر هەیە کە خەریکە دێتە پێشەوە، ئەویش سەردەمی ڕێککەوتنی زانست و ئایینە و، بێگومان ئەو ڕێککەوتنە تەنیا لە نێوان زانستی ڕاست و ئایینی ئیسلامدا نەبێت کە پارێزراوە لە هەموو گۆڕانکاری و دەستکارییەک لەگەڵ هیچ ئایینێکی دیکەدا نابینرێت.



خەڵکی ئەم سەردەمە، توێژەران، مامۆستایانی زانکۆ، پێشەوایانی بیری مرۆڤایەتی هەموو دەتوانن زانستەکانی ئەم پەرتوکە خواییە بپشکنن. خۆ ئێستا ئەوان لە دەرخستنە گەردوونییەکاندا زۆر لە پێشەوەن. لە هەمان کاتدا قورئان باسی لەو گەردوونە و مرۆڤیش کردووە.

ئەی ئەنجامەکە چی بوو؟ وەڵامەکە با لە دیمانەی ئەم پرۆفیسۆرانەوە وەربگرین، کە چواردە پرۆفیسۆرن لە بوارە جیاجیاکانی زانستدا و کاتێك ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەریان لە بوارەکەی خۆیاندا پیشان دەدرێت، بە ویژدان و بە بوێرانە شایەتی ڕاستی بوونی زانیارییەکان دەدەن و، هەندێکیان موسڵمان دەبێت، هەشیانە زۆر بە ڕاشکاوانە دەڵێت: "بێگومان موحەممەد پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خودایە".



07501269689
07511408868


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوباریك- نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)






٥٠٠٠ هەزار دینار
ISBN: 978-9922-626-45-1


